

# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە ١٣

( حوزیران )ی ٢٠٠٦

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات

- فۆرمات کردنی کۆمپیوتەر و دانانی ویندۆز ئێکس پی و کرداری پارتیشن
- چی دەکەین ئەگەر لە ناکاو سیستەمی ویندۆز تێک بچێت
- درووستکەری یەکەم سایتی ئەنتەرنێت لە جیهاندا
- پەیوەندی کردنی تەلەفۆنی لە رێگای ئەنتەرنێتەوە
- بەرنامەیەکی تایبەت بە مۆبایلی سۆنی ئەریکسۆن












پاشکۆی گۆڤار : سی دی تایبەت بە گۆڤارەکە

هەولێر ـ ٢٠٠٦



# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە
١٣
حوزەیرانی - ٢٠٠٦

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت - وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات


خاوەنی ئیمتیاز
وەزیری ڕۆشنبیری

سەرنووسەر
ئاراز مەولود ڕەشید

بەڕێوەبەری نووسین
فاخر مەحمود میرزا

بەڕێوەبەری هونەری
سالم بابە شیخ

دەستەی نووسەران
ڕێناز ئەردەڵان بەکر
کاوە سلیمان
شاخەوان عمر حسن

سەرپەرشتی چاپ
ئەهرۆ مەحمود
چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە


تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لەڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت


ناونیشان :
هەرێمی کوردستان/ عێراق - هەولێر . بەرامبەر دەرگای قەڵا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا
نهۆمی دووەم شوێنی مەلبەندی کۆمپیوتەری ئاراس ی کۆن بۆ هەر پێشنیار و سەرنجێك
یان ناردنی بابەتێك .پەیوەندی بکەن بەسەرنووسەرەوە بەم ناو نیشانە . :
دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری - بەرێوەبەرایەتی کۆمپیوتەر - یان ناونیشانی سەرەوە .
یان بە ژمارە تەلەفۆنی نووسینگەی گۆڤار : **2527054** یان مۆبایلی سەرنووسەر **07504618045**

یان پۆستي ئەلکترۆنی :

E.mail: computer_magazine_2005@yahoo.com
aras_co_center@yahoo.com




ئاگاداری :

بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ بڵاو کردنەوە لەگۆڤارەکەمان با بەتەواوی ئاماژە بکەن بەناونیشان و سەرچاوەی ئەو بابەتەی کە دەینێرن بە پێچەوانەوە ئێمە بەرپرسیار نین لە هیچ لێپرسینەوەیەك.

کۆمپیوتەر

ژمارە ١٣ (حوزیران) ی ٢٠٠٦






# پێرست

# ئەو بەرنامانەی کە لە ناو سیدی ژمارە ١٣ دا هەیە

ئا: هێرش اسماعیل

### بەشی ANTIVIRUSE

GHOSTCURF PRO 2005 -*
MCAFEE VIRUSSCAN 2006 -*
NORTON ANTI VIRUSE 2006 BETA -*
PC CILLIN 2005 -*
ZONE ALARM 5.5 -*
ZONE LAPS IMSECURE -*

### بەشی CD.COPY

BURST COPY 2.7 -*
CD CHECK 3.1.4.0 -*
CRYPT CD PRO 4.0 -*
GAME CLONER 1.15.11 -*
ULTRALSO ME 7.5.1012 -*
VIRTUAL CLONE DRIVE 5.1.0.1 -*

### بەشی DESIGEN

ACDSee v8.0.39 FULL -*
COLLAGE MAKER 2.02 -*
DEEP PAINT 2.0 -*
FOCUS FHOTOEDITOR 4.1.2 -*
FULL SHOT 8.52 -*
IMAGE DIGGER 2.0 -*
MORPHEUS 1.85 -*
PHOTO MIX 5.3 -*
PHOTO SHAMAN 1.2.2 -*
PIXRESIZER 1.0.8 -*

### بەشی FLASH TOOLS

FLASH MENU 1.3.2 ١٢٢ -*
DREAM FLASH SEE 1.2 -*
EASY GIF ANIMATOR 7.0 -*
FLASH DESKTOP V.2 -*
GOLDSHELL FLAX 3.0.1 -*
MAGIC SWF2AVI V.2.01 -*
Micromedia Flash Player 8 -*
SAVE FLASH 3 -*
TORNADO FLASH PLAYER -*

### بەشی INTERNET

ANTI PORN 7.0.6.10 -*
CRAAGLE -*
DALIL INTERNET -*
DOWNLOAD MANAGER 4.0.5.3 -*
DOWNLOAD STUDIO 1.0.0.7 -*
DOWNLOUD ACCELERATOR 7.4 -*
FIRE WALL 2.5 -*
GET RIGHT 5.2d -*
HOTBAR -*
IMAGE CO-TRACKER 2.0 -*
MASS DOWNLOADER 3.0 ARABIC -*
MSN MESSENGER 7.5 -*
Netscape Browser 8.0.2 -*
opera 8.5 -*
REAL TUNNEL -*
SPEED CONNECT 5.0.4 -*
STGANOS ANONYM PRO 7.1.5 -*
TURBO BROWSER 9.3 -*
Yahoo! Messenger 7.437 -*

### بەشی MULTIMEDIA

ARIAL SOUND RECORDER 1.2.11 -*
AUDIO EDIT MAGIC 7.2 -*
DVD AUDIO EXTRACTOR 3.3.2 -*

*- JET AUDIO PASIC 7.0
*- PHOTO 2 DVD STUDIO 3 V.4.5.0.26
*- PHOTO 2 VCD STUDIO 3 V.4.5.0.26
*- POWER CONVERTER XP
*- QUICK TIME 7.2
*- SUPER VIDIO SPLITTER 1.8
*- TEXT SOUND 2.3
*- WIN DVD 7
*- Windows Media Player 10.3923 for WinXP

بەشی SPECIAL

*- BEE ICON 4.0.2
*- BLEEM 1.5B FULL
*- CRAZY TALK 4.0
*- EPSXE 1.6
*- GAME GAIN
*- GAME MAKER 6.1
*- GAME XP 1.5.1.20
*- HYPER CALENDAR 22.37
*- ICON MAKER
*- MULTIMEDIA BUILDER 4.9.6
*- Nvidia 77.30 WIN-XP
*- POWER ARSHIVER 2006
*- POWER ZIP 7.05.3879
*- SATCODX
*- SMART PHON RECORDER 3.0
*- WARNING BANNER CREATOR
*- WIN ACE 2.6.4
*- WIN RAR 3.50 BETA 7
*- win zip 10.0 beta

بەشی TOOLS

*- AAA Real Recorder
*- CLEEN DISK 3.1.4.0
*- DESKTOP CLOCK 2.0.1
*- DISK CLEANER 1.5.4
*- DRIVE GENIUS 4.0.845
*- ERROR DOCTOR 2006
*- FILE SECURER 3.81
*- HANDY RECOVERY 2.0
*- OO DEFRAG V6
*- RECOVER MY FILES 3.76
*- REGISTRY CLEANER 4.02.01
*- REGISTRY CLEANER EXPERT 3.57
*- REGISTRY MESHANIC 4.02.01
*- RENAME 4U 1.14
*- SERIALS 1.3.1
*- SPEEDER XP 1.60
*- STAR SKIN 2.4.5.1
*- STYLE XP 3.0 MALE
*- TWS TRIALEN
*- WINDOWS WASHER 6

بەشی Video Edit

*- All Video Splitter 1.3.7
*- AURORA MEDIA WORKSHOP 2.4.19
*- BLAZE MEDIA PRO
*- FULL VIDIO CONVERTER 2.8.9
*- MPGABLE X4 LIVE 2.2
*- POWER VIDIO CONVERTER
*- Super DVD Ripper 2.36
*- Video Fixer 3.23
*- VIDIO CD CUTTER 4.04

# بەرنامەی FaceFilter Studio

ئا: هەڤاڵ نوری

بۆئەوانەی کەحەزبەگۆرینی شکل و دەستکاری کردنی شێوەی پێکەنین و تورەبون و قەڵەوی و لاوازی وێنەدەکەن ئەوبەرنامەیە شتێکی نایابە بەراستی چەندکارێکی زۆرسەیر ئەنجام دەدات ئەگەر کاری لەسەربکەیت خۆت دەیبینیت من کاتێ دەستکاری وێنەیەکم کرد لەوبەرنامەیە بینیم کەبەشێوەك وێنەکەی گۆری کەخۆم بروام نەدەکرد بەوشێوەجوانە وێنە بگۆرێت بێ ئەوەی هەستی پێبکەیت وێنەی ئەو کیژەی کە شکلی ئاسایە توانیم بەپێکەنینی بێنم بەرێزان کارکردن لەسەرئەوبەرنامەیە سەرەتا بەرنامەکە دەکەیتەوە بەم شێوەیە (وێنە١)




وێنە ژمارە ١

سەیری لای دەستەراست بکە لەسەرەوە شێوەی نۆپن هەیە ئەگەربتەوێ هەر وێنەیەك بەویستی خۆت بێنیە ناوبەرنامەکە پاشان سەیری سەرەوەی بەرنامەکە بکە وێنەی کامیرەیەك و سێ دەمووچاو کراوە بەداگرتنی دەمو چاوی یەکەم شکلی ئەو وێنەی هێناوتە ناوبەرنامەکە دیاریدەکرێت (وێنە ٢)




وێنە ژمارە ٢



پاشان بەداگرتنی دەموچاوی دوەم وێنەکە تاریك و روناك دەکرێت (وێنە٣)

وێنە ژمارە ٣



پاشان بەداگرتنی دەموچاوی سێیەم دەستکاری وێنەکەت دەکەیت بەویستی خۆت (وێنە ٤)

وێنە ژمارە ٤

سەیری لای راستی بەرنامەکە بکە هەمووشکلەکانی بۆت دیاری کردوە تۆش بەکەیفی خۆت هەڵیان دەبژێریت ئینجا ناخیرشت لەسەرەوە بەشێوەی فایلە دایدەگریت وێنەکە بەتەواوی و بەگەورەیی دەبێتەوە هەروەها لەسەرەوە لەلای راست وێنەی فلۆپیەك کراوە بۆخەزن کردنی وێنەکەتە وێنە ٥



وێنە ژمارە ٥

# گۆڕینی دەنگ بەچەند شێوەیەکی جیاواز لەبەرنامەی Cool Edit Pro

ئا: کاوە سلیمان

ئازیزان وەك هەموجار ئەمجارەش باس لەسودێکی بەهێزی ئەم بەرنامەیەدەکەین ئەویش گۆڕینی دەنگە بەچەند شێوەیەك واتا تۆیەك دەنگت هەیە دەتەوێ سودی لێوەرگری بەتایبەتی بۆمۆنتاجی ئەفلام کارتۆن کە دەنگی ئافەرتو مندالو پیرەمێردت دەست ناکەوێت دەتوانیت لەرێگای ئەم بەرنامەیە ئەم دەنگانە دروست بکەیت سەرەتا پاش هێنانی دەنگەکە بۆناو ئەوبەرنامەیە دێیتە سەر Effects لەوێوە دێیتە سەر tim/petch لەوێوەش Stretch کلیکێکی لەسەردەکەیت بەماوس لیستێك دەبێتەوە لەم لیستەدا سەیری لایدەستەراست بکە لەناو چوارچێوەسپیەکە چەند شتێك هەیە بەگۆڕینی ئەم شتانە دەنگی مندال و ئافرەت و دەنگی پیرەمێردت دەست دەکەوێت وێنە ٢ پاشان Ok دەکەیت ئینجا لەناوهاردەکەت دەی پارێزیت.




وێنەی ژمارە ١




وێنەی ژمارە ٢

# چۆنیەتی کاری زیپ کردن و پاشان دامەزراندنی بۆ شوێنی مەبەست بە پرۆگرامی ( WinZip )

ئامادەکردنی: محمود محمد حسن ساڵەیی
mehmud_felek@yahoo.com

ئەگەر ویستمان قەبارەی فایلێك یان چەند فایلێك بچووك بکەینەوەو وەکو یەك فایل مامەڵەی لەگەڵدا بکەین واتە وەکو (EXE)، ئەوە پرۆگرامی (WinZip) ئەم کارەمان بۆ ئەکات. ئەتوانی بۆ دامەزراندنی فۆنتەکانیش بەکاری بهێنی... بۆ نموونە هەندێ وێنەم هەیە سەرەتا (select all) ئەکەین وەك وێنە (١):




دوای ئەوە ئەچینە سەر یەکێك لە فایلە دیاری کراوەکان و کلیکی لای ڕاست ئەکەین و پاشـــان (send to) و پاشان (Compressed Folder) دائەگرین وەکو وێنە ژمارە (٢):






دوای كه‌مێك چاوه‌ڕوانی فایلێك دروست ئه‌بێت كه‌ هه‌موو فایله‌كان له‌ خۆ ئه‌گرێت كه‌ تاوه‌كو ئێره‌ نیوه‌ی كاره‌كه‌مان ئه‌نجام داوه‌... ئێستا فایلێكی نوێ دروست بووه‌و ئه‌چینه‌ سه‌ری كلیكی لای ڕاست دائه‌گرین و ئه‌چینه‌ سه‌ر (WinZip) وپاشان (Creat Self-Extracter <.EXE>) وه‌كو وێنه‌ ژماره‌ (٣):

دوایی به‌رنامه‌كه‌ت بۆ ئه‌بێته‌وه‌ كه‌ دوو بۆشایی هه‌یه‌:

١. (Creat Self-Extracter Zip file from ) كه‌ شوێنی فایله‌كانه‌.
٢. (Defualt "Unzip to" folder) لێره‌ تۆ بۆ دامه‌زراندنی فایله‌ زیپ كراوه‌كانت شوێنێك هه‌ڵئه‌بژێریت بۆ نموونه‌ ('E:\MEHMUD SALEYI). وه‌كو وێنه‌ ژماره‌ (٤):




لێره‌دا كۆتایی به‌ كاره‌كه‌ دێت فایلێكی زیپ كراو دروست ئه‌بێت و به‌قه‌باره‌ بچووكترو ئاماده‌ بۆ كار پێكردن.
تێبینی: پێویسته‌ پرۆگرامی (WinZip)ت دامه‌زراندبێت.

# زنجیرەی ( ٥ ) لە بەرنامەی Auto Cad

ئامادەکردنی / غزالە یونس

بەرێزان وا ئەم جارەش لە زنجیرەیەکی تری بەرنامەی AutoCAD دا باس لە چەند فرمان و ئایکۆنی تردا دەکەین . بەهیوای سوود وەرگرتنتان و کە ڵك وەرگرتنتان. بەڵام زیاتر بە هیوای ئەوەم مانگانە ئایکۆنەکان و فرمانەکان بە دەستی خۆتان جێ بە جێ بکەن و وێنەی بۆ بکێشن.



وێنەی ژمارە ١

**Polyline -١**

ئەم فرمانەش دەکەوێتە لیستی وێنەکردن جا لێرەدا بە سێ شوێن دەتوانین بانگی بکەین هەروەك هەموو فرمانە کانی تر .

١- لە لیستی زانیاریە Commandکان و نوسینی ناوی فرمانە کە .

٢-لە لیستی کەرستەکان و کلیك کردن لەسەر ناوی فرمانە کە .

٣-لە لیستی وێنە کردن Draw. (وێنەی ١)

کارو فرمانی وێنە کردنەوە لە کاتی بانگ کردنیدا چە ند فرمانی تری لاوە کی تێدایە وەك :-

Specify next point or [Arc/ Halfwidth/Length/Undo/Width

جا هەریەك لە مانە کارو فرمانی خۆی هەیە و بەدەست نیشان کردنیان کارەکە جێ بە جێ دەکات بۆ نموونە :-

Arc : بۆ دروست کردنی کەوانە بە کاردێت.

Halfwidth : ئەمەش بو ئەوەی ئەگەر بمانەوێت پانیەك بدەینە هێڵێك جا سەرەتا ئەم دێرە دێت Specify starting width <0.0000>: واتە پانی یان ئەستوری سەرەتای هێڵەکە چەندە جا لێرەدا ئەگەر وای دانێین ٥ بێت وEnter دابگرە.




وێنەی ژمارە ٢

پاشان ئە م دێرە دێت Specify ending width <5.0000>: واتە پانی یان ئە ستووری کۆتایی هێڵەکە چەندە . ئێمە بە ئارەزووی خۆمانە دە نوسین ٥ . پاشان داوای درێژی راستەهێڵەکە دەکات ئەگەر گوتمان درێژییەکەی ٢٠ . (وێنەی ٢)

Length :لێرەدا داوای درێژی ڕاستەهێڵەکە دەکات .

Undo :بۆ گەڕانەوەی هەنگاوەکان بۆ دواوە یەك لە دوای یەك.

Width :هەمان کاری Halfwidth هەیە بۆ پانی هێڵ بە کاردێت.

٢- Arc :- ئەمەش بە کاردێت بۆ دروست کردنی کەوان یاخود دەتوانین بڵێین پارچەیەك لە بازنە دروست بکەین .ئەمەش وەك هەموو ئایکۆنەکانی تر بەچەند ڕێگایەك بانگی دەکەین .

١-لە شریتی کەرستەکان .

٢-لە شریتی زانیارییەکان Command.

٣-لە لیستی وێنەکردن Draw. (وێنەی ٣)



وێنەی ژمارە ٣

کەواتە دەتوانین بڵێین ئەم فرمانە لەمانەی خوارەوە پێك دێت.

Point :-ئەمەش بۆ دروست بونی داوای سێ خاڵ دەکات ، واتە دەبێت بەهەر سێ خاڵ تێپەڕبێت جا بۆ نموونە ئەم سێ خاڵەی (١٠٠,١٠٠) و (١٥٠,١٠٠) و(٢٠٠,٤٠٠) مان تاقی کردەوە وەك (وێنەی A-٤ )




وێنەی ژمارە ٤

Start, Center, End :-بە هەمان شێوە لێرەدا داوای سێ خاڵ دەکات ئەمیش خاڵی دەست پێکردنە پاشان خاڵی چەق و ئینجا خاڵی کۆتایی بۆ نموونە خاڵی (٥٥٠,١٠٠) و(٣٥٠,٢٠٠) و(٦٠٠,٣٠٠) وەك (وێنەی ٤-B).

بەڕێزان ئەوانەی لەو لیستە ماون تە نها سەردێرەکانی باس دەکەین بە هیوای ئەوەم خۆتان لەسەر Auto CAD هەوڵی دروست کردنیان بدەن .

Start, Center ,Angle
Start, Center,Length
Center, Start,End
Center, Start, Angle
Center, Start, Length
Start, End, Direction
Start, End,Raduis
Start, End, Angle

جا لێرەدا بەڕێزانم ئێوە خۆتان دەتوانن خاڵی بۆ دەست نیشان بکەن و وێنەی بۆ بکێشن وەك وێنەی ٤ بە هیوای سود وەرگرتنتان .

خوێنەرانی خۆشەویست لە کۆتایی زنجیرەی ئەمڕۆدا (وێنەی ٥)




کە لە بەردەمتان دا هەیە وێنە یەکی سادە و سانایە بۆ ئێوەی خۆشەویست بە جێی دەهێڵم بە هیوای ئەوەم هەریەك لە لای خۆی بتوانێت دروستی بکات و بە هەموو ڕێگاکانی وێنەکردن کە لە پێشدا باسمان لێوە کردووە ئێوەش دروستی بکەن و سودی لێ وەربگرن .

وێنەی ژمارە ٥

وێنەکەش بریتیە لە چوارگۆشەیەك کە درێژی و پانی یەکەی ٢٠٠ یەکەی درێژیە و پێك هاتوە لە بازنەیەك نیوە تیرەکەی ٥٠ یەکەی درێژیە کە ئەمیش Polygon( چەند لایەکی لە ناوەوەیە بە هەمان نیوە تیرە .

# بەرنامەی ALZIP

ئا: سەروین عبد الله

ئازیزان وەك دەزانن بەرنامەی زیپ بەرنامەیەکی بچوکە بۆبچوك کردنەوەی بەرنامەکان و کردنەوەی بەرنامە بەیەك بەستراوەکان بەکاردێت ئەوبەرنامە بچوکە چەندکارێکی زۆرگرنگ ئەنجام دەدات بۆنمونە تۆکۆمەڵێك وێنەت هەیە یاخود کۆمەڵێك دەنگت هەیە ئەگەر ئەوفایلانەی کەهەتە ئەگەر بیانکەیتە سیدیێك سەیردەکەیت هەرلایەکەو بەلایەك پەرت بوە یاخود ژمارەیان هێندە زۆرن کەتوانای سەیرکردنیانت نیە لەم کاتە ئەوبەرنامەیە ئاسانکاریەکی تەواوت بۆدەکات بەبەستنەوەی کۆمەڵێك شت بەیەکەوە کەلەکۆتایدا هەموو ئەوشتانەی کەدەتەوێت بیانکەیت بەیەك تەنها یەك شتی بچوکی قەبارەبچوکی لێ دروست دەبێت هەروەها تۆئەوشتەی کەدەتەوێ زیپی بکەیت قەبارەکەی زۆربچوك دەبێتەوە بەپێی ئەوبەرنامەی بەکاری دێنیت بەرنامەی زیپ چەند جۆرێکی هەیە بەڵام ئەوەی کەمن تازەبەدەستم گەیشتبێت ئەویش بریتیە لەبەرنامەی ALZIP ئەوبەرنامەیە توانای بچوك کردنویەکی زۆرسەیری هەیە لەچاوبەرنامەکانی تر هەروەها خێراییەکەشی زۆرە لەچاوزیپەکانی تر کارکردن لەسەر ئەوبەرنامەیە زۆر ئاسانە ئێستا من دەمەوێت فایلێك لەناو کۆمپیوتەرەکەی خۆم زیپ بکەم دەچمە سەر فایلەکە کلیکێکی بەلای‌راست لەسەردەکەم ئینجا add to zip هەڵدەبژێرم (وێنە ۱)




وێنەی ژمارە ۱

دەبینم بەخێرایەکی زۆرخێرا فایلیك بەوناوەی لەخوارەوەزیاد دەبێت ئەگەر بێتو دووجار کلیك لەسەر ئەوفایلە بکەم کەتازە دروست بوە دەبینم فایلەکەیە کەخۆم زیپمکردبوو بەلام قەبارەی بچوك ترەو هەموو شتەکانیش بوینە تەنها یەك شت (وێنە ٢)



وێنەی ژمارە ٢

## ئاگاداری

**بۆ هەموو ئەو بەرێزانەی کە توانای نووسینیان هەیە لە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسینی بابەتیان هەیە لەم بوارەدا دەتوانن بەشداری بکەن لە گۆڤاری کۆمپیوتەر و دەتوانن سەردانمان بکەن یان بابەتەکانیان بنێرن بۆ ئەم ناونیشانە .**

**هەرێمی کوردستانی عێراق / ناو بازار بەرامبەر دەرگای قەلا بالەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم شوێنی مەلبەندی کۆمپیوتەر ئاراس یان بە ژمارە تەلەفۆنی ئاریا فۆن ٢٥٢٧٠٠٥٤ یان مۆبایلی کۆرەك ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ یان بە هۆی پۆستی ئەلکترۆنی**

Email : aras_co_center@yahoo.com **یان** computer_magazine_2005@yahoo.com

# زنجیرە (٧) لە بەرنامەی Adobe Premier

## درێژکردن و پڕکردنەوەی کەلێنی نێوان دیمەنەکان

ئا: فەیسەل

لە زنجیرەی پێشوو باسمان لەوە کرد کەوا چۆن دیمەنەکان دەبڕین و بۆ ئەوەی کارەکان لە سەر پارچەیەك لە دیمەنەکان ئەنجام بدەین بێ ئەوەی کار بکاتە سەر پارچەکانی تری دیمەنەکە، لەم زنجیرەیە دا باس لە چۆنیەتی درێژکردنەوە و پڕکردنەوەی کەلێنی نێوان دیمەنەکان دەکەین لە ئەنجامی بڕین یاگواستنەوە دروست دەبن:




1. دیمەنەکە کار پێ دەکەین و بەدوای ئەو خاڵە دەگەڕێین کە ئیقاعی بابەتە دەنگیەکە سەر لە نوێ بەرز دەبێتەوە، لە پەنجەرەی Monitor شاشەی نمایشی Program بەکار دەهێنین بۆ دۆزینەوەی خاڵی مەبەست کە بریتی یە لە چرکەی (١٥,١٣) دیمەنەکە . (وێنەی١)

2.پێش ئەوەی بچینە سەر هەنگاوی دواتر پێویستە دڵنیا بین لە جێ بەجێ کردنی هەنگاوی پێشوو و هێڵی دەستکاری Edit line لە چرکەی مەبەست دەوەستێت، هەروەها دەتوانین پشت بە شەپۆلی چینی دەنگیەکە ١ Audio ببەستین . (وێنەی ٢)٠




وێنەی ژمارە ٢

3.لە فەرمانی بڕین پاشگەز دەبینەوە و سەر لە نوێ ئامرازی دیاری کردنSelection tool کلیك دەکەین یا دوگمەی V لە کیبۆرد دادەگرین . (وێنەی٣)٠




وێنەی ژمارە ٣

4.ئێستا دیمەنی چوارەم و کۆتایی Final .avi دەجولێنین تا لەگەڵ سەرەتای هێڵی دەستکاری رێك دەبێت ، پارچەی یەکەم لەم دیمەنە دەست پێ دەکات لەگەڵ سەرەتای گۆڕانی ئیقاعی بابەتە دەنگیەکە . (وێنەی٤)٠

5.جوڵاندنی دیمەنی چوارەم بەرەو لای راستە دەبێتە هۆی دروست بوونی کەلێنێك و بۆشایەکی کاتی لە زنجیرەی رووداوەکان . (وێنەی٥)٠



وێنەی ژمارە ٤



وێنەی ژمارە ٥

6.پڕکردنەوەی ئەم کەلێنە کاتیە بەوە دەبێت کە بەشی دووەمی دیمەنی سێیەم درێژ بکەینەوە ، کەبریتیە لە دیمەنی پایسکل سوارەکە کە لە هەنگاوەکانی پێشووتر لە دیمەنەکان جیامان کردەوە. بە درێژکردنەوەی ئەم بەشە کەلێنەکە پڕ دەبێتەوە ، بەلام لە هەمان کاتدا دەبێتە هۆی ئەوە کە دیمەنەکە لە سەر خۆ بجوڵێ و دەربکەوێ ،بۆجیێ بەجێ کردنی ئەم کردارەش ئامرازی Rate stretch لە Rolling Edit هەڵدەبژێرین. (وێنەی٦)٠



وێنەی ژمارە ٦

7.کێرسەری ماوسەکە دەجوڵێنین و رای دەکێشین تا بۆشایەکە پڕ دەکەینەوە هەر وەك لە (وێنە٧) دا دیارە٠



وێنەی ژمارە ٧

8.بەشە براوەکەمان درێژکردەوە بۆ ئەوەی کەلێنەکە پڕبکاتەوە ئێستا کرداری بینین ئەنجام دەدەین . (وێنەی (٨)٠



وێنەی ژمارە ٨

# بەرنامەی (SmartMovie Converter (UIQ)

# بۆوەرگێرانی گشت فایلەکانی ڤیدیۆیی

ئا: سنۆبەر خضر

بەرێزان هەندێجار دەستکەوتنی بەرنامەیەکی بچوك زۆر ئاسانە بەلأم ئایا ئەوبەرنامە چ کارێك ئەنجامدەدات یاخود چۆن بەکاردێت و بۆچی بەکاردێت ئەم کردارانە زۆرجار وامان لێدەکات کە زوو لەبەرنامەکانی کۆمپیوتەر بێزاربین بەلأم من بەپێچەوانەوە دەڵێم ئەمانە هەرهەمووی دەبێتە هۆی دەسکەوتنی بەرنامەی بەسود پاش خۆماندوکردن بێگومان بەئەنجامێك دەگەیت بۆیە بەرێزان حەزدەکەم ئامۆژگاری هاورێکانم بکەم لەم بوارە ئەوەتا پاش ماندو بونیچکی کەم بەم بەرنامە بەسودە گەیشتم ئەویش بەرنامەی SmartMovie Converter (UIQ) خۆشەویستان بەرنامەیە بەسە بۆئەوانەی کەدەیانەوێت جۆری ڤیدیۆکان بگۆرن بەگشتی واتا ئەگەر هاتو ئێستا من پارچە ڤیدیۆێکم هەبێت ئەو ڤیدیۆیە جۆری MPG یاخود AVI یان هەرجۆرێك بێت بمەوێت بیگۆرِم بۆجۆری MP4 یان DV یاخود کام جۆر کەمن پێویستمە ئەم بەرنامەیە ئاسانکاریەکی تەواوم بۆدەکات ئەم کارە ئەنجام دەدات و هەروەها من بەتێروانینی خۆم دەڵێم ئەم بەرنامەیە لەهەر هەموو بەرنامە کۆنڤێرتەرەکان خێرا ترە ئەگەر کاری لەسەربکەن هەست بەخێرایی ئەم بەرنامە دەکەن لەچاو بەرنامەکانی تر بەکار هێنانیشی زۆر ئاسانە سەرەتا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە (وێنە ١)




وێنەی ژمارە ١

پاشان بمانەوی پارچە ڤیدیۆکە بێنینە ناوبەرنامەکە سەیری بەرنامەکە بکە لەناوە راست لەلای سەرەوە OPEN &CONVERT&HELP&FILES هەیە بۆهێنانی پارچە ڤیدیۆکە OPENلێدەدەین لیستی هاردەکان دەبێتەوە (وێنە ٢)



وێنەی ژمارە ٢

ئینجا لەوشوێنەی پارچە ڤیدیۆکەت هەلگرتوە دێیتە ئەو شوێنە ڤیدیۆکە ئۆپن دەکەیتە ناوبەرنامەکە بەم شێوەیە (وێنە٣)




وێنەی ژمارە ٣

سەیری لای راستی بەرنامەکەبکە لەسەرەوە Configure هەیە ئەوەیان بۆگۆڕینی جۆری فایلەکەیە یەك کلیکی لەسەر بکە هەمو جۆرەکانی گۆرین دەبێتەوە (وێنە ٤)



وێنەی ژمارە ٤

پاشان Convert لێدەدەیت و برێك چاوەروان دەبیتو ریندەرەکە تەواو دەبێت هەروەها ئەم بەرنامەیە وەك ڤیدیۆکەتەریش بەکاردێت سەیری ناوەراستی بەرنامەکەبکە لای چەپ set start هەیە بەکلیك کردن لەسەر ئەوە سەرەتای برینی ڤیدیۆکە دەست پێدەکات و هەروەها لەتەنیشت ئەوەش set endهەیە ئەمەش بۆکۆتایی هێنانە بەبرینی ڤیدیۆکە لەتەنیشت ئەوەش splitهەیە ئەمەش بۆ لێکدانی پارچە ڤیدیۆکانە وێنە ٥

## ئاگاداری

داوا لە هەموو خوێنەرانی گۆڤارەکەمان دەکەین ئەگەر هەر بەرێزێك پێشنیار یان تێبینی یان سەرنجێکی هەیە یان هەر کەم و کوریەکیان بە دی کرد لە گۆڤارەکە با ئاگادارمان بکاتەوە بەم ناونیشانەی خوارەوە .

هەرێمی کوردستانی عێراق / ناو بازار بەرامبەر دەرگای قەلا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم شوێنی مەلبەندی کۆمپیوتەر ئاراس یان بە ژمارە تەلەفۆنی ئاریا فۆن ٢٥٢٧٠٥٤ یان مۆبایلی کورەك ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ یان بە هۆی پۆستی ئەلکترۆنی

Email aras_co_center@yahoo.com : یان computer_magazine_2005@yahoo.com

# زنجیرە(٧) ی بەرنامەی فلاش MX

ئا: فەیسەل معروف

## کتێبخانە لە فلاشدا(بەشی یەکەم)

لەم وانەیەدا باسی هەندێ کاروبار دەکەین کە کار ئاسانیەکی زۆری بەکارهێنەرو دیزاینەری کارەکان دەکات لە فلاشدا ئەویش کتێبخانەیە ، کتێبخانە بەکار دێت بۆ هەڵگرتن و بە کار هێنانی گشت ئامرازەکان و هەروەها بەکار هێنانی ئەو قاڵبانەی کە پێشتر دیزاین کراون و هەڵسو کەوت کردنیش لە گەڵ کتێبخانەی هاوبەش.بۆ کردنەوەی پەنجەرەی کتێبخانە:

١. لە لیستی Window فەرمانی Library کلیك دەکەین ، یاخود هەردوو دوگمەی(Ctrl+L) لە کیبۆرد دادەگرین. (وێنەی ١).

بۆ دروستکردنی هێما Symbol لە نێو کتێبخانە ، لە ڕێگای Optionsفەرمانی New Symbol هەڵدەبژێرین ، هەروەها دەستکاری هێماش لە پەنجەرەی سەر بەخۆ دەبێت وە سوود لە بوونی چینەکان و شریتی کاتی سەربەخۆ وەردەگرین بۆ هەر هێمایەك ،ئەوەش کارە ئاڵۆزەکان سانا دەکات وە پاشان کۆپی دەکەین لە کتێبخانە بۆ پەنجەرەی وێنە ، وە بۆ چونە سەر دیمەنەکەش Scene کلیك دەکەین .(وێنەی٢).




وێنەی ژمارە (١)

٢. زیاد کردنی وێنە وشتی تر بۆ کتێبخانەی پرۆژەکان تەنها لە ڕێگای فەرمانی Convert to Symbol دەبێت لە لیستی Insert.

بەکار هێنانی بابەتێك و دانانی لە فلیم فەرمانی کتێبخانە Library لیستیWindow هەڵدەبژێرین و پاشان ڕای دەکێشینە پەنجەرەی وێنە.

هێمایە وەرگیراوەکان لە کتێبخانە تەنها بەم دوو ڕێگایەی خوارەوە هەموار( تعدیل) دەکرێن:

شکاندن و پەرت کردنی بابەتەکان بەهەڵبژاردنی فەرمانیBreak Apart لە لیستی Modify ، یا داگرتنی هەردوو دوگمەیCtrl+Bلە کیبۆرد.

هەموار کردنی هێمای سەرەکی لە پەنجەرەی کتێبخانە بە دەبڵ کلیك کردن لە سەری لە گەڵ گۆڕانی هێمای سەرەکی لە کتێبخانەدا ئەوا هەموو وێنەکانی لەم هێمایە وەرگیراون دەگۆڕێن•

## دەستکاری کردن بە بە کار هێنانی بەرنامەیەکی دەرەکی

١.بابەتەکە دیاری دەکەین.

٢. فەرمانی Edit with لە لیستی Options هەڵدەبژێرین و

چوار چێوەی دیاری کردنی بەرنامەی دەستکاری دەرەکی select external editor بۆمان دەکرێتەوە.

٣.بەدوای بەرنامەیەکی گونجاو دەگەڕێین و پاشان Openکلیك دەکەین.

٤.دەستکاری بابەتەکە دەکەین و هەڵی دەگرین ، فلاش هەڵدەستێ بە نوێ کردنەوەی Updateبابەتەکە لە ناو کتێبخانە.




وێنەی ژمارە (٢)

**نوێ کردنەوەی بابەتی هێنراو لە کتێبخانە**

١.فایلە هێنراوەکە لە کتێبخانە دیاری دەکەین.

٢.فەرمانی نوێ کردنەوەUpdate لە لیستی Optionsهەڵدەبژێرین.

٣.چوار چێوەی نوێ کردنەوەUpdate media بۆ مان دەکرێتەوەو ئایکۆنی Update کلیك دەکەین.

**کتێبخانەی هاوبەش لە فلاش MX**

بەرنامەی فلاش کۆمەڵێکی زۆری وێنە و پارچە دیمەن و دوگمەی ئامادە کراو و کاری هونەری و دەنگ لە خۆ دەگرێت ، بۆ نمایش کردنیشیان فەرمانی Common Libraries لە لیستی Window کلیك دەکەین .(وێنەی ٣).

دەتوانین کتێبخانەی هاوبەش بە کار بهێنین لە ناو هەر پڕۆژەیەکدا ئەویش بە راکێشانی بابەتەکە دەبێت لە کتیبخانەوە بۆ کتێبخانەی پڕۆژەکە.




وێنەی ژمارە (٣)

بۆ دروستکردنی کتێبخانەی تایبەت یا کتێبخانەی پڕۆژە بکەینە کتێبخانەی هاو بەش و بەکاری بهێنین لە پڕۆژەی تر :

١.دروستکردن و یا هێنانی ئەو بابەتانەی دەمانەوێ لە کتێبخانەی تایبەت دایان بنێین.

٢.لە لیستی File فەرمانی save هەڵدەبژێرین.

٣.فۆڵدەری کتێبخانە Libraries دەدۆزینەوە.

٤.ناوێکی بۆ دادەنێین و فەرمانی هەڵگرتن کلیك دەکەین ،بەم شێوەیە لە لا لیستی (قائمە الفرعیە) Common Libraries لە لیستی Window هەڵی دەگرین.

٥.بۆ بینینی پارچەیەکی سینەمایی دروستکراو لە نێو کتێبخانە و کۆپی کراو،لە پەنجەرەی وێنە فەرمانی Test Movie لەControl هەڵدەبژێرین.

فەیسەل مەعروف

# بەرنامەیەکی گرنگ و پێشکەوتوو
# Ace opimizer utilites

زنجیرەی سێیەم

بێستون عمر

بەشی سێیەم بریتیە لە (Protect) کە ئەویش لە دوو فەرمان پێك هاتووە فەرمانی یەکەم بریتیە لە (Securely Delete Files) ڕەش کردنەوەی فایلەکانی کۆمپیوتەر بەشێوەیەکی زۆر ورد ، لە ڕاستیدا مەبەست لە سڕینەوەی فایلەکان لەم ڕێگایەدا واتا نەمانی بەیەك جاری وە بەهیچ بەرنامەیەك و کردارێکی کۆمپیوتەر ناگەڕێنەوە ناو سیستەم ، بۆ جێبەجێکردنی ئەم فەرمانە دوای کلیك کردن لە سەر (Protect) ئەم دوبەشە دەردەکەون ئێمە کلیك لەسەر (Securely Delete Files) دەکەین بڕوانە وێنەی (١)




وێنەی ژمارە ( ١ )

پاشان بۆکسێك دەکرێتەوە بڕوانە وێنەی (٢)




وێنەی ژمارە ( ٢ )

پاشان ئێمە دوڕێگامان هەیە بۆ دانانی ئەم فایلانە لەناو ئەم بۆکسە بۆ سڕینەوەیان ، وەك لەوێنەی (٢) دیارە یان فایلەکان بە هەڵبژاردەی خۆمان یەك بەیەك دادەنێین بە کلیك کردن لەسەر ( Add file)یان تەواوی فۆڵدەرەکە هەڵدەبژێرین ئەویش بە کلیك کردن لەسەر ( Add folder)دوایش فۆڵدەرەکە دەست نیشان دەکەین و تەواوی فایلەکان دێنە ناو بۆکسەکەو بۆ ئەنجامدانی سڕینەوەی بە یەکجاری کلیك لەسەر ( delete All)دەکەین بروانە وێنەی (٣) .




وێنەی ژمارە (٣)

پاشان بۆکسێك دێت دڵنیامان دەکاتەوە کە ئەم فایلانە ئەگەر بسڕیتەوە ئەوا لەناو دەچن ناتوانیت بیانگەڕێنیتەوە . ئێمەش ئەگەر مەبەستمان سڕینەوەیان بێت ئەوا ( Yes) هەڵدەبژێرین بەمەش فایلەکان یەك بەیەك دەسڕێنەوە بروانە وێنەی (٤) .



وێنەی ژمارە (٤)

فەرمانی دووەم کە بریتیە لە سڕینەوەی داتاکانی فایلەکانە ((Wipe deleted file data مەبەستمان لە ئەنجامی کارکردنمان بە بەردەوامی لەناو کۆمپیوتەر ڕۆژانە چەندان فایل دروست دەکرێن و دەسڕێنەوە جا ئەو فایلانەی تەنها ( Delete)دەکرێن ئەمانە ناسڕێنەوە لە راستیدا بەڵکو تەنها ناوەکانیان نامێنێت جا بۆ ئەوەی ئێمە بتوانین خۆمان ڕزگار بکەین لە و فایلانەو قەبارەی کۆمپیوتەر بە سروشتی و ئاسایی و بمێنێتەوەو کۆمپیوتەر هەمیشە ئاڵۆز نەبێت ئەوا بەم کردارە ئەم فایلە بێکەڵکە ونبوانە لە ناو دەبەین :

لەسەرەتادا وەکو لە وێنەی (١) دیارە کلیك لەسەر ( Wipe deleted file data)پاشان بۆکسێك دەکرێتەوە وەك لەوێنەی (٥) دیارە



وێنەی ژمارە ( ٥ )

دێین بەشێکی قورسی کۆمپیوتەر هەڵدەبژێرین بە مەبەستی خۆمان بەڵام لە هەڵبژاردەی دووەم تەنها فایلەکانی ناو ریسایکل باین دەسڕێتەوە پاش دەست نیشان کردن کلیك لەسەر ( Next)دەکەین وەك لەوێنەی (٥) دیارە . ئینجا دەچینە هەنگاوی دواتر دوبارە کلیك لەســەر ( Next) دەکەین بەمەش بۆکسێکی تر دێت بڕوانە وێنەی (٦)



وێنەی ژمارە ( ٦ )

یەکێك لە و چوار هەڵبژاردەیە دەست نیشان دەکەین پاشان کلیك لەسەر ( Start)دەکەین بڕوانە وێنەی (٧) بەمەش دەست بە سڕینەوەی فایلە ونبووە بێکەڵکەکان دەکەین . لە کۆتایی هەنگاوەکەدا کلیك لەسەر ( finish)دەکەین




وێنەی ژمارە ( ٧ )

## ئاگاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ گۆڤارەکەمان تکایە لە کاتی وەرگێرانی هەر بابەتێك ئاماژە بکەن بە ناونیشان و سەرچاوەی ئەو بابەتەی کە ئەینێرن بە پێچەوانەوە ئێمە بەر پرسیار نین لە هیچ لێپرسینەوەیەك .

# بەرنامە ی (TEXT SOUND)

ئامادەکردنی : دەومن شێخ مسعود سالەیی
DAWAN1985@YAHOO.COM

(یە کێکە لە هەرە بەرنامە باشەکانی کە کاری پێ دەکرێت وەکار ئاسانیەکی ئێجگار زۆر مان بۆ دەکات ئەم بەرنامە یـە بەکارد یێت بۆ گۆرین لە ( نوسین ەوە بۆ دەنگ )واتا لە (TXT) (TYPE) ەوە دەگۆرێت بۆ (WAV).




چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم بەرنامە یە:

۱ دەنوسینەوە وەکو لە وێنەی ژمارە (۱) دیارە

وێنەی ژمارە ۱

(جۆری سەرەتا فیلێکی (ADD) دواتر دەچینە بەشی سەرەوە لەناو بەرنامەکە کلیك لەسەر وەکو لە وێنەی زمارە ۲ ) دا دیارە.




وێنەی ژمارە ۲

(CONVERT)دەکەین و دەیهێنینە ناو بەرنامە کە دواتر کلیك لەسەر بۆنەوەی گوێ بیستی بـین ((Preview)) . دەکەین لە کۆتایی دا کلیك لەسەر وەکو لە وێنەی ژمارە (٣) دا دیارە.



وێنەی ژمارە ٣

وە دەتوانین ئەو دەنگەی کەبۆمان دخوێنێتەوە بە ئارەزووی خۆمان دەست کاری تێ بکەین لە هەڵبژاردنی دەنگەکان وەکو پیاو و ئافرەت وە خێرایی خوێندنەوەی (EDIT)خاوبونەوەی بۆ ئەم کارە دەچینە بەشی سەرەوە وەکو لە وێنەی ژمارە (٤) دا دیارە.



وێنەی ژمارە ٤

# ڕێکخستنی لیستی بەرنامەکان

هێدی کامەران

لیستی بەرنامەکان کە بریتیە لە تەواوی ئەو بەرنامانەی لە ناو سیستەم هەن وە ئەو بەرنامانەش کە بەکارهێنەری کۆمپیوتەر دادەمەزرێنێت لە ناو کۆمپیوتەری تایبەتی خۆی ، زۆری و کەمی بەرنامەکان و جۆراو جۆربونیان بە گوێرەی زەوق و تواناو حەزی بەکارهێنەر دەگۆریت بۆ نمونە هەندێك کەس زۆرترین ئەو بەرنامانەی کە دادەبەزێنن بریتین لە بەرنامەکانی تایبەت بە وێنەو دەستکاریکردنیان هەندێکی تر بەرنامەی تایبەت بە زمانەکان وبەرنامە سازی کۆمپیوتەر دادەمەزرێنن هەیانە جۆراو جۆرو لە فرە بەرنامەکان کاردەکەن . جا زۆری ئەم بەرنامانە لە ناو لیستە بەرنامەکان وا دەکات کە لیستی بەرنامەکان زۆر درێژ بێت وە هەندێکجار تەواوی دسیك تۆپ داگیر دەکات و سەریش لە بەکارهێنەر تێك دەدات ئاخۆ لەم کاتەدا ئەو بەرنامەی ئەو دەیەوێت کامە بەرنامەیەو لە کامە شوێنی لیستی بەرنامەکانە یان ئەواتا دەبێت بەوردی بە دوای بگەرێت تاکو بتوانێت بیدۆزێتەوە ئەم گەڕان و ورد بینیەش بۆ کردنەوەی بەرنامەیەك بۆ هەموو جارێك شتێکی ناخۆشە بۆیە ئێمە بەپێویستمان زانی بە ئاسانترین و سەرەتاترین ڕێگاو کلاسیکی ترین ڕێگا بێین لیستی بەرنامەکان وەك چۆن خۆت دەتەوێت وا ڕێکی بخەیت و بەشێوەیەك کە هەموو لیستی بەرنامەکان بەشێوەیەکی زۆر ڕێك و پێك دابەش بکەیت بۆنمونە بەرنامەکانی وێنە بە جیابکەیتە یەك لیست و بەرنامەکانی تایبەت بە ئەنتەرنێت لە یەك لیست و بەرنامەکانی تایبەت بە کاری ڤیدیۆ و مونتاژکردن لە لیستی تر بەمەش هەم لیستی بەرنامەکان کورت و هەم پوخت و هەم کارکرن تیایدا ئاسان و هەم گەڕان و زوو کردنەوەی بەرنامەکان ئاسانە و ڕێك و پێکترین لیستی بەرنامەت دەبێت بە ئارەزووی خۆشت دەتوانیت ناوی هەریەك لە کۆمەڵەکان کوردی لاتینی یان بە عەرەبی بنوسرێن لە لایەکی تریش دەتوانین جگە لە بەرنامەکان فایلی جۆراو جۆریش لە لیستی بەرنامەکان ڕێك بخەین بۆ نمونە ئەگەر فایلێکی ئەکسڵی گرنگ کە ڕۆژانە کارمان پێی هەیە یان چەند گۆرانیەك کە زوو زوو ئێمە گوێبیستیان دەبین بە هەمان کردار لەدوای کۆپی کردن و پەیست کردنیان لە ناو فۆڵدەری بەرنامەکان دەتوانین ڕێکیان بخەین ، بۆ ڕێکخستنی بەرنامەکانیش لە سەرەتادا کلکی ڕاست لەسەر ناوی دەستپێکردن (Start) دەکەین ئینجا کلیك لەسەر (Open) دەکەین بروانە وێنەی (١)

وێنەی ژمارە ١

پاشان دەچینە سەر بەشی فۆڵدەرەکانی لیستی دەست پێکردنەوە ئێمە فۆڵدەری بەرنامەکان هەڵدەبژێرین بڕوانە وێنەی (٢)



وێنەی ژمارە (٢)

ئینجا دەست دەکەین بە دروست کردنی چەند فۆڵدەرێك ئەویش بە داگرتنی کلیکی ڕاست و هەڵبژاردنی فرمانی (New) ئینجا کلیك کردن لە سەر (Folder) وەك لەوێنەی (٣) دیارە



وێنەی ژمارە ٣

پاشان چەند فۆڵدەرمان مەبەست بێت هەریەکەو ناوی مەبەستداری خۆی لێدەنێین و ئینجا بە فەرمانی کۆپی وپەیست واتە دەست نیشان کردن و ئینجا کۆپی کردن (Copy) و ئینجا پەیست کردنی((Paste لە ناو ئەم فۆڵدەرانە یەکە یەکەی بەرنامەکان دەخەینە ناو فۆڵدەرە مەبەستدارەکانەوە ئینجا هەموو پەنجەرەکان دادەخەین دوایی سەیری لیستی بەرنامەکان دەکەین دەبینین وەك چۆنمان ویستوە وا ڕێکخراوە یان ئەگەر ویستمان چەند گۆرانەیەك بێنین بۆ ئەویٚ یان چەند فایلێکی کارگوزاری بەهەمان شێوە بروانە وێنەی ژمارە (٤) .



وێنەی ژمارە ٤

# فۆرمات کردنەوەی کۆمپیوتەر و دانانی ویندۆس xp و کرداری پارتیشن

نا:هیوا عبدالنافع heewanafi@yahoo.com

بەرێزان سلاو..... حەزم کرد چۆنیەتی فۆرمات کردنەوەی کۆمپیوتەر شی بکەمەوە لە چەند هەنگاوێکی ئاسان . وەك لەم هەنگاوانەی خوارەوە:

ئەگەر کۆمپیوتەرەکەت پێویستیەتی دووبارە فۆرمات بکرێتەوە وە دووبارە ویندۆزی بۆ دابنرێتەوە، پێویستە یەکەم جار لە تۆری کارکردن بپچرێندرێت، وە پاشان ئەو هەنگاوانەی کە دێن ڕەچاویان دەکەین.

ئاگاداری: فورمات کردنی کۆمپیوتەرەکەت دەبێتە هۆی لادانی هەموو فایلەکانی ناو کۆمپیوتەرەکەت. ئەوەش هەموو دیکۆمێنتەکان، وێنەکان،یان مۆزیقاکان دەگرێتەوە کە تۆ لە یەکەم ساتەوە لە ناو کۆمپیوتەرەکەت داناون.

١- ئەو فایلانەی کە دەتەوێ بیانپارێزی هەلیانبگرە. دەتوانیت ئەو فایلانە کۆپی بکەین لە ناو فلۆپی دیسکەکان، دیسکە بچووك کراوەکان، فلاش مێمۆریەکان، یان لە ناو سی دی، دی فی دی، یان شتێکی تر کە گونجاو بێت.

Press any key to boot from CD..._

وێنەی ژمارە ١

٢- سی دی ویندۆز ئێکس پی لە ناو سی دی ڕۆم دابنێ ئینجا کۆمپیوتەرەکەت ڕیستارت بکەوە.

کۆمپیوتەرەکەت پێت دەڵێت هەر کلیلێك لە کلیلەکان داگرە بۆ چوونە ناو بووت لە ڕێگای سی دی.کلیلێك داگرە لە ناو تەختەی کلیلەکان بۆ دەست پێکردنی دانانی ویندۆز.(بەلآم دەبێ یەکەم بووتی کۆمپیوتەرەکەت سیدی بێت وە ئەگەر وا نەبوو ئەوا دەبێ لە بایۆسەوە ئەم کردارە بکەی) لە بەر درێژی بابەتەکە باسم نەکردوە.

هەر کلیلێك داگرە بۆ چوونە ناو بووت لە ڕێگەی سی دی. . .وەك لە وێنەی (١)

دەبێ ئێستا کۆمپیوتەرەکە فایلەکانی دانان دابنێت. ئەوەش لەوانەیە چەند خولەکێك بخایەنێت.وەك لە وێنەی (٢)

وێنەی ژمارە ٢




دەبێ خشتەیەکت پێنیشان بدرێت. ئینتەر داگرە بۆ دانانی ویندۆز ئێکس پی.وەك لە وێنەی (٣)

وێنەی ژمارە ٢



مۆڵەتیکی ڕێککەوتن بەدیار دەکەوێت. بیخوێنەوە وە F8داگرە کاتێك ئامادەبووی. وەك لە وێنەی (٤)

وێنەی ژمارە ٤

Windows XP Licensing Agreement

Microsoft Windows XP Professional

END-USER LICENSE AGREEMENT

IMPORTANT-READ CAREFULLY: This End-User License Agreement ("EULA") is a legal agreement between you (either an individual or a single entity) and Microsoft Corporation for the Microsoft software product identified above, which includes computer software and may include associated media, printed materials, "online" or electronic documentation, and Internet-based services ("Product"). An amendment or addendum to this EULA may accompany the Product. YOU AGREE TO BE BOUND BY THE TERMS OF THIS EULA BY INSTALLING, COPYING, OR OTHERWISE USING THE PRODUCT. IF YOU DO NOT AGREE, DO NOT INSTALL OR USE THE PRODUCT; YOU MAY RETURN IT TO YOUR PLACE OF PURCHASE FOR A FULL REFUND.

1. GRANT OF LICENSE. Microsoft grants you the following rights provided that you comply with all terms and conditions of this EULA:

* Installation and use. You may install, use, access, display and run one copy of the Product on a single computer, such as a workstation, terminal or other device ("Workstation Computer"). The Product may not be used by more than two (2) processors at any one time on any

F8=I agree ESC=I do not agree PAGE DOWN=Next Page

ئینجا دەبێ تۆ هارد درایڤەکەت ئامادەبکەیت بۆ دانانی ویندۆز. لیستێکی هارد درایفەکان لەگەڵ دابەشکردنەکان دەبینی. وەك لە وێنەی (٥)

وێنەی ژمارە ٥

Windows XP Professional Setup

The following list shows the existing partitions and unpartitioned space on this computer.

Use the UP and DOWN ARROW keys to select an item in the list.

- To set up Windows XP on the selected item, press ENTER.
- To create a partition in the unpartitioned space, press C.
- To delete the selected partition, press D.

15360 MB Disk 0 at Id 0 on bus 0 on atapi [MBR]

C: Partition1 [FAT32] 15359 MB ( 15355 MB free)

ENTER=Install D=Delete Partition F3=Quit

سڕینەوەی بەشەکان کە بەندن بە :C. بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە، بەشەکە دەست نیشان بکە وە کلیلی D داگرە. دانـانـی ویندۆز لەوانەیە ئاگادارت بکاتەوە کە ئەوە بەشکردنی سیستەمە. ئینتەر داگرە. وەك لە وێنەی (٥ و ٦)

```
Windows XP Professional Setup

The partition you tried to delete is a system partition.

System partitions may contain diagnostic or hardware configuration
programs, programs to start operating systems (such as Windows XP),
or other manufacturer-supplied programs.

Delete a system partition only if you are sure that it contains
no such programs or if you are willing to lose them. Deleting a
system partition may prevent your computer from starting from
the hard disk until you complete installation of Windows XP.

  • To delete this partition, press ENTER.
    Setup will prompt you for confirmation before
    deleting the partition.

  • To go back to the previous screen without
    deleting the partition, press ESC.

ENTER=Continue   ESC=Cancel
```

وێنەی ژمارە ٦

بۆ تەواوکردنی سڕینەوەی بەشەکە، L داگرە کە ئەم شاشەت دیت. وەك لە وێنەی (٧)

```
Windows XP Professional Setup

You asked Setup to delete the partition

   C:  Partition1 [FAT32]                 15359 MB ( 15355 MB free)

on 15360 MB Disk 0 at Id 0 on bus 0 on atapi [MBR].

   • To delete this partition, press L.
     CAUTION: All data on this partition will be lost.

   • To return to the previous screen without
     deleting the partition, press ESC.

L=Delete   ESC=Cancel
```

وێنەی ژمارە ٧

دەگەڕێیتەوە بۆ خشتەی بەشکردن. دەبێت هێمای بۆشاییەکی بەشنەکراو هەبێت لە خشتەکەدا. دەست نیشانی بکـە وە C داگرە بۆ دروست کردنی بەشکردنێکی نوێ. وەك لە وێنەی( ٨ )



وێنەی ژمارە ٨

دانانی ویندۆز دەبێ پرسیارت لێبکات بۆ قەبارەی بەشکردنەکە. دەبێ بۆشاییەکە پڕبکەیتەوە بە گوێرەی قەبـارەی ئـەو هارد درایڤەی کە تۆ دەتـەوێ. ئێمە پێشنیاز دەکەین کە تۆ نەیگۆڕی و بە ئاسایی ئینتەر داگری. وەك لە وێنەی ( ٩ )



وێنەی ژمارە ٩

جارێکی تر دەگەڕێیتەوە بۆ خشتەی بەشکردنەکە. پێویستە خشتەکردنێکی نوێ هەبێ بۆ :C ناونرابێت بەشکردنی ١ [New <Raw>]. دەست نیشانی بکە و ئینتەر داگرە. وەك لە وێنەی (١٠)



وێنەی ژمارە ١٠

ئێستا پرسیارت لێدەکرێت کە چ جۆرە سیستەمێکی فایلت دەوێ بۆ فۆرمات کردن لە ناو درایفەکە. ئێمە بەباشی دەزانین کە تۆ NTFS هەڵبژێری (خێرا بێت یان جۆرەکەی تر). ئینتەر داگرە بۆ بەردەوام بوون. وەك لە وێنەی (١١)



وێنەی ژمارە ١١

درایفەکە ئێستا دەبێ فۆرمات ببێ. لەوانەیە ئەمە چەند خولەکێك بخایەنێت. پاش تەواو بوونی ئەم هەنگاوە هارد

وێنەی ژمارە ١٢




دانانی ویندۆز دەبێ ئێستا ئەو فایلانە کۆپی دەکات لە CD یەکەوە کە پێویستن بۆ دانانی ویندۆز ئێکس پی. ئەمە لەوانەیە هەندێك خولەك بخایەنێت. وەك لە وێنەی (١٣)

وێنەی ژمارە ١٣



پاش ئەوەی فایلەکان کۆپی بوون، دانانی ویندۆز کۆمپیوتەرەکەت ڕیستارت دەکاتەوە. وەك لە وێنەی (١٤)




وێنەی ژمارە ١٤

پاش ٤٠ ـ ٦٠ خولەك، دانان دەبێ کۆتایی بێت وەك لە وێنەی (١٥) وە کۆمپیوتەرەکە ڕیستارت بێت بۆ ناو ویندۆز. لەم کاتەدا پێویستە لە سەرت بەرنامەی دژە فایرۆس دابنێی، firewall ەکە دابگیرسێنی، وە ویندۆز نوێ بکەوە لەگەڵ هەر نوێ کردنەوەیەکی پاراستنی گونجاو. وێنەی (١٥)




وێنەی ژمارە ١٥

# چی دەکەین ئەگەر لەناکاو ویندۆز تێکچوو ؟

ئا: کارۆ ژیلوان

وەك ئێمەدەزانین کەفۆرماتو ویندۆزدانانەوەی تاکەچارەیە بۆگەڕاندنەوەی کۆمپیوتەر بۆبارودۆخی جاران بەلام ئەگەر ئێمە شتی گرنگمان لەهاردی C دانابو یاخود لەمایدۆکۆمێنت یان لەسەرشاشە خۆهەرهەموی دەڕوات باشە ئەگەربمانەوێ بەسیستەمێك ویندۆز بێنینەوە بارودۆخی جاران بێ ئەوەی شتەکانمان لێ بروات ئەوا لەوکاتە دەبێت کۆمپیوتەر سیستەم ڕێستۆر system restore ی بکەین بۆ ئەنجامدانی ئەوکارە سەرەتا ئەگەر هاتو کۆمپیوتەرەکە توانای نەمابوو بێتە سەر ویندۆز ئەوکاتە بە Safe mode دەچینە سەر ویندۆزەکە ئەوکاتە خۆی داوای سیتەم ڕێستۆری دەکات ئەگەر خۆی داوای نەکرد ئەوا start بکەوە برۆ سەر progams لەوێوە Accessoris لەوێوەش system tools ئینجا System Restore (وێنە ١)



وێنەی ژمارە ١

کلیکێکی لەسەربکە لیستێك دەبێتەوە بەم شێوەیە (وێنە ٢)



وێنەی ژمارە ٢

پاشان نێکست بکە ئینجا لیستێکی تر دێتەپێش کەوەك جەدوەلی سالانەیە تۆ تەنها یەك ژمارە وەرە دواوە کلیك لەسەر ئەو ژمارە بکە کەلەدواوە دێیتە سەری پاشان نێکست بکە ئینجا finish لێبدە چاوەڕوان بە تا تەواودەبێت ئەوکاتە کۆمپیوتەرەکەت خۆی ڕێستارت دەبێتەوە دێتەوە شێوەی جاران وێنە ٣



وێنەی ژمارە ٣

# تا چەند هەبونی گۆڤاری کۆمپیوتەر پێویستە ؟

**ڕیپۆرتاژ و فۆتۆ : ڕێناز ئەردەلان بکر**

گومان لەوەدا نیە کە کتێبخانەی کوردی دەوڵەمەندە بە بوونی گۆڤاری جۆراو جۆر لە بوارە جیا جیاکان هەروەها جگە لە گۆڤارە کوردییەکان گۆڤاری بیانیش تا ڕادەیەك بەرچاو دەکەوێت ٠ بەلآم ئایا هەبوونی گۆڤاری زانستی تا چەند گرنگە ؟ هەبوونی گۆڤارێکی وەك کۆمپیوتەر تا چەند سوودمەندە ؟ تا چەند هاولآتیان وەك هۆکارێك بۆ دەستکەوتنی زانیاری بە کاری دەهێنن ؟ ئایا قوتابیانی زانکۆ سوودیان لێ وەرگرتووە ؟ بۆ وەلآم دانەوەی ئەم پرسیارانە ڕووی پرسیارمان ئاراستەی قوتابیانی کۆلێژی ئاداب کرد کە بەم شێوەیە بۆچوونی خۆیان دەربڕی ٠



**سەرەتا هێمن هادی قوتابی لە بەشی شوێنەوار گووتی :**

بوونی گۆڤارێکی وا زۆر گرنگە بۆ ئەوەی خەڵك زیاتر خۆی ڕۆشنبیر بکات لە بواری کۆمپیوتەر . ئێمە لە وولآتی خۆمان لە ڕووی کۆمپیوتەر زۆر دوا کەوتووین ، وە ئەم گۆڤارە دەتوانێت کارێك بکات خەڵك بەرەو پێشتر ببات ئێمە دەبینین خەڵك لە وولآتانی جیهاندا تا ڕادەیەکی کەم قەڵەم بەکار دێت بۆیە با ئێمەش پلە بە پلە هەنگاو بنێین و بە تایبەتی گەنجان بتوانن بە شێوەیەکی بەر فراوان سوود لەم بوارە وەربگرن و ئەم گۆڤارە ببێتە لادانی ئەو کۆسپ و ئاستەنگانەی کە لە بواری کۆمپیوتەر دێتە بەردەم قوتابیان ٠



**ئیبراهیم محمد حەسەن قوتابی لە بەشی عەرەبی دەڵێت :**

هەبوونی گۆڤارێکی زانستی تایبەت بە کۆمپیوتەر بە شتێکی گرنگی دەزانم پێویستە هەبێ بۆ شارەزا بوونی نەك هەر قوتابیان بەڵکو سەرجەم هاولآتیان لە بواری کۆمپیوتەر ، چونکە کۆمپیوتەر زانستێکی گرنگە کە بتوانین زۆرترین سوودی لێ وەربگرین وەکو قوتابی زانکۆش دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ ئەوەی زانیارییەکان لە گشت بوارەکان بە زووترین کات بگاتە دەستمان . هەروەها بۆ زانیاری دەرەکیش پێویستە بۆ ئەوەی نەك هەر تەنیا پشت بە مەنهەجی خۆمان ببەستین بەڵکو بە شێوەیەکی بەر فراوان زانیاریمان دەست بکەوێت .



**ڕێبین زرار قوتابی لەبەشی زمانی عەرەبی بەم شێوە هاتە دووان :**

سەبارەت بە گۆڤارە زانستیەکان بە تایبەتی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ئێستا وەکو پێویستیەکی سەردەمە . مەنهەجی زانکۆ هیچ گرنگی بە بواری کۆمپیوتەر نەداوە بۆیە پێویستی زۆرمان بەو جۆرە گۆڤارە زانستیانە هەیە بە تایبەتیش گۆڤاری کۆمپیوتەر پێویستە بۆ هەموو قوتابیانی زانکۆ گرنگی لەوەدا بەدی دەکرێ کە ئەو زانستەت فێر دەکات کە قوتابی پێویستی پێیەتی چونکە لەمەنهەجی تایبەتی گرنگیەکی ئەو تۆ بە بواری کۆمپیوتەر نەدراوە بە تایبەتی لەبەشە ووێژەییەکان .



**محمد صالح قوتابی لە بەشی زمانی کوردی دەڵێت :**

پێم وایە هەبوونی گۆڤارێکی زانستی کۆمپیوتەر بۆ سەردەمی ئێستای کۆمەڵگەی کوردی زۆر پێویستە ئێستا کۆمپیوتەر وەك جیهانێکی نوێ یە هەموو کارەکان بەکۆمپیوتەر دەبێت هەر چەندە من لەبەشی کوردیشم بەڵام شعر هیچ شتێك ناکات بۆ من بەڵکو کۆمپیوتەر زیاتر سود بەخشە. بەگشتیش زانکۆی سەلاحەدین گرنگی بەکۆمپیوتەر نەداوە تەنانەت ئەو بەشانەی تایبەتن بەکۆمپیوتەریش بەتەواوی کۆمپیوتەریان بۆ دابین نەکراوە ئەم گۆڤارە بۆ ئێمەی قوتابی زۆر سودمەندە بەڵام زیاتر بۆمە تیۆریە گەر کۆمپیوتەر هەبێ ڕۆژانە مارەسەی لەسەر بکەین ئەوا زیاتر سودمەندە.



**شیلان علی عبدللە دەڵێت :**

بونی ئەو گۆڤار ە زۆر پێویستە پێش ئەوەی قوتابی بێتە زانکۆ پێویستە خۆی هەوڵی فێرکردنی کۆمپیوتەر بدات لەقۆناغەکانی ناوەندی و دوا ناوەندی چونکە ئێستا کۆمپیوتەر پێویستیەکی ژیانە .



**ئارام کەمال قوتابی بەشی فیزیا گوتی :**

تاڕادەیەك باشە کەلێنێکی پڕکردۆتەوە بەڵام پێم باشە هەنگاوی باشتر بنێت بابەتەکانی زۆربەی زانستی بێت نەك تیجاری پێویستی ئەم گۆڤارە لەوە دایە گەر لەمەنهەجی خوێندن باسی ئەم زانستەمان بۆ نەکرێ هانا بۆ ئەم جۆرە گۆڤارانە دەبەین لە دەرەوەی مەنهەجی خۆمان گۆڤارێکی وانەبێ زانیاری تەواومان دەست ناکەوێ .



**سەیوان ئەمین قوتابی بەشی کوردی گوتی :**

بە دڵنیاییەوە گۆڤارێکی وەك کۆمپیوتەر گرنکی خۆی هەیە لەبەر ئەوەی ئێستا کۆمپیوتەر بەشێکی گەورەی لەژیانی ئێمەدا پڕ کردۆتەوە ئێمە وەك قوتابی زانکۆ سودمان لە مەنهەجی خۆمان وەرنەگرتوە بۆیە دەبێ پەنا بەرین بۆ شتی لاوەکی وەك ئەم جۆرە گۆڤارە زانستیانە .

**نەهرۆ ئبراهیم قوتابی بەشی زمانی کوردی بەم شێوەیە بۆچونی خۆی دەربری :**

بونی ئەم گۆڤارە من زۆر بە پێویستی دەزانم هەر لاپەڕەیەك کە دەربارەی زانستی کۆمپیوتەر بێت زیاد لەپێویست کۆمەڵگە پێویستی پێیەتی ئێمە کە هاتونەتە زانکۆ لە خوێندنی پێش زانکۆمان لە زانستی کۆمپیوتەر بێ بەش بوین بۆیە بە بۆچونی من لە قۆناغەکانی ناوەندی و دواناوەندی ئەم جۆرە گۆ ڤارانە بڵاو بکرێتەوە پێشم وایە هەموو کەس پیویستی بە خوێندنەوەی ئەم گۆڤارە هەیە بۆ ئەوەی لەم بوارە نەختێك تێگەیشتنمان هەبێ .



# دروستکەری یەکەم سایت لە جیهاندا

وەرگێرانی لە عەرەبیەوە: صلاح الدین دۆسکی
سەرچاوە: البوابة العربیة

ئەگەر کەمێك بە ووردی سەیری ئەو هەموو سایتانە بکەین کە لە ناو تۆڕی ئینتەرنێتدا هەیە زۆر سەرمان سوڕ ئەمینێت لێیان وچۆن ئەو شتە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا هەیە .. ئەوەی زیاتر جێگەی سەرنجە ئایا بەم شێوە زۆر خێرایە چۆن تەشەنەی کرد کە ناگاتە بیست ساڵ لە دروست بوونی ئینتەرنێت وسایتدا .. پێم خۆش بوو یەکەم دروست کەری سایتتان پێ ئاشنا بکەم وبزانین کێیە ئەو شەرەفەی بەرکەوتووە ویەکەم کەس بوە سایتی لە تۆڕی ئینتەرنێتدا دروست کردووە .. ؟



بەڕێزان .. ئایا رۆژێك لە رۆژان بیرت لەوە کردۆتەوە بزانیت کێ یەکەم سایتی لە ناو ئینتەرنێت دروست کردووە وئەو بۆتە هۆی دروست بوونی ئەو هەموو سایتەی کە هەیە .

( تیم بیر نرز لی ) لە مانگی ئابی ١٩٩٧ یەکەم سایتی لەسەر ئینتەرنێت دروست کرد وئێستا دوای پانزە ساڵ ژمارەی سایتەکان زۆر لە ژمارەی دانیشتوانی سەرزەوی زیاتر بوون .. ئەو ناوە ناوێکی وونە وزۆربەمان نەمان بیستووە وبەڵکو سەربازیکە وئەو توانیویەتی کارێکی زۆر بێ وێنە بکات .. ناوی نرا ( Father of the Web) واتە: باوکی تۆڕی ئینتەرنێت .. ( تیم بیر نیرز ) لە ساڵی ١٩٨٤ لە زانکۆی ئۆکسفۆرد بڕوانامەی بەدەست هێناوە ودوو ساڵ لە کۆمپانیای بلیسی بوە بۆ کاروباری گەیاندنی لاسلکی .. لە ساڵی ١٩٨١ تا ١٩٨٤ بەڕێوەبەری کۆمپانیای ( Image Computer Systeme Ltd) بوە ولە ساڵی ١٩٨٩ پێشنیاری پرۆژەیەکی کرد کە بۆ نوسین بەکار ئەکات بە ناوی ( World Wide Web) ویەکەم کەس بوو کە ( www ) ی نووسی ئەم کارەشی لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٠ بوو .. لە ساڵی ١٩٩١ تاکو ساڵی ١٩٩٣ زۆر بە جدی هەوڵی دروستکردنی سایتی ئینتەرنێتی ئەدا وبەردەوام پێناسەکانی ( HTML, HTTP, URIS) بۆ خەڵکی روون ئەکردەوە .. هەر بەو بۆنەیەوە شازادەی بەریتایا نازناوی شاسواری دا بە تیم بیر نرز.

# هەنگاوە گرنگەکانی دروست کردنی سایتێکی بازرگانی

زنجیرەی دووەم کۆتایی

هێمن محسین

٦ - هەنگاوی شەشەم کە بە هەنگاوێکی گرنگ دادەنرێت بریتیە لە دانانی لیستی پێکهاتەکانی سایتەکە کە ڕێك و هاوتا بێت لەگەڵ داواکاری میوانەکان بەبێ کەموکوڕی یان بەبێ گرفت وەکو سەرەتایەك پاشانیش بۆ هەریەك لەمانە ڕونکردنەوەو زانیاری تەواو و پێویستی تێدابێت وە بەردەوام گۆڕانکاری و بەردەوام چاودێریکردنی بازاڕو ئاگاداربون لە گۆڕانکاریەکان و گۆڕینیان .

٧ - بۆ ئەوەی ناوی ماڵپەڕەکە زۆر بەسانایی بتوانرێت بزانرێت و وە بەکارهێنەرانیش بتوانن بەبێ هەڵە ئەم ماڵپەرە بکەنەوە بەبێ ئەوەی هەڵە لە نوسینی پیتەکانی ناوی سایتەکە بکەن بۆ هەموو ئەمانە پێویستە ناوی دۆمەینەکە واتە ناوی ماڵپەرەکە کورت بێت تاکو دەتوانرێت وە لە مەبەستی کارو پرۆژەکان و مەبەستەکانی کۆمپانیاکە نزیک بێت .

٨ - لەم هەنگاوەدا دەبێت زۆر



وێنەی ژمارە ١

بەوردی پۆستی ئەلیکترۆنی ناو سایتەکە نەخشەی بۆ بکێشین و دابنرێت و زۆر بە ئاسانی نامەکان بگەنە کۆمپانیاکەو لەلایەن میوانەکەشەوە وەربگیرێنەوە ، چونکە تاکە هێڵی بەیەك بەستنەوەی میوانەکان و کۆمپانیاکەیە ، چونکە کە ئەمەش نەبوو واتا سایتەکە دادەبڕێت لە کۆمپانیاکەو بەبێ ئەوەی ئاگاداری پەیوەندیەکانی خۆی بێت .

٩- لەم هەنگاوەدا دەست دەکەین بە جێبەجێکردن بۆ کڕین و فرۆشتنی ئەلیکترۆنی بەمەش پاش هەموو ئەم مەرجانە دەبێت نەخشەیەکی زۆر ڕێك و زۆر سەرنج ڕاکێش و زۆر ئاسان لە کردنەوە زوو دەرکەوتنی هەموو ئایکۆن و

هەموو پێك هاتەکانی بە ئاسانی ، وە دەست نیشان کردنی سەرپەرشتیاران و فەرمانبەرانی تایبەت بە بەڕێوەبردنی ئەم سایتە وەکاتێك هەست کرا کە ئەم سایتە پێش کەوتووە ئەوا وا پێویست دەکات بۆ زیاتر بەرەو پێش بردنی ببێتە لایەنێکی سەربەخۆی کۆمپانیاکەو ئیدارەیەکی تایبەت بەخۆی هەبێت .

١٠ - ئیدارەی گشتی کە بەگرنگترین خاڵ دادەنرێت کە بریتیە لە بازرگانی کردن و فرۆشتن و ساغ کردنەوەی کاڵاکان و هەوڵدان بۆ گرتنەبەری ڕێگاو بیرۆکەی زۆر ورد بۆ ناساندن و بڵاوکردنەوەی ناونیشانی سایتەکەو پەخش کردنی بەناو



وێنەی ژمارە ٢

زۆرترین وڵاتاندا تاکو بتوانرێت زۆرترین میوان دروست بکات بۆ ئەم مەبەستەش ٣٠٪ بڕی ئەو پارەی کە بۆ بینا کردنی ئەم سایتە تەرخان کراوە بۆ ڕیکلام و ناساندنی سایتە کە بێت وە ٥-١٠ ٪ پارەی تەرخان کراو بۆ گۆڕانە لە ناکاوەکانی ناو سایتە کە تەرخان بکرێت چونکە هەڵەیە گەر بڵێین دوای ئەپلۆد کردن ئیتر ئەم سایتە کارکردن تیایدا گرنگ نیەو ئەرکەکان کۆتاییان هاتووە . چونکە بینا کردنی سایتە بازرگانیەکان هەروا بەسادەیی تێناپەڕێت بەڵکو دەبێت بەردەوام چاودێری بکرێت و تاکو دەگاتە ئاستی سروشتی و ڕێکخاری خۆی .

# هەموو شتێك لە ئەنتەرنێت بدۆزەرەوە

ئەژین شێرکۆ

## بەشی سێیەم

دەتەوێت لە ئەنتەرنێت بەدوای چیدا بگەرێت ئارەزوی چ دەکەیت؟ ئەوا پێویستت بە ماڵپەرەکانی گەران هەیە من لێرەدا هاوکار دەبم بۆ ئەوەی بتگەینمە ناو هەموو ئەو بزوێنەرانەی کە تۆ ئارەزویان دەکەیت ، بۆ نمونە من ئارەزوی گەران بەدوای بەرنامەدا بکەم یەکێکی تر حەز دەکات زانیاری لەسەر ماڵپەرکانی تایبەت بە کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت پەیدا بکات بۆ ئەوەی بگەیتە هەرچی دەتەوێت بەدەستی بێنێت سەردانی ئەم سایتانە بکە :

ماڵپەرەکانی وەرگێرانی سایت بۆ زمانە جۆراو جۆرەکان .

**http://www.yourdictionary.com/**
**http://www.ectaco.com/**
**http://www.tarjim.com**
**http://www.cimos.com/TradNet.htm**
**http://www.alqamoos.com/**
**http://www.almisbar.com/**
**http://www.world.altavista.com**
**http://www.0border.com**



### ماڵپەری تایبەت بەهەواڵ

htt://www.arabnews.net
htt://www.bbcarabic.com
htt://cnn.com
http://news.bbc.co.uk/hi/arabic/news/default.htm http://www.aljazeera.net/
http://www.moheet.com/new/index.asp

### ماڵپەرەکانی گرافیك

http://www.home4arab.com/members//c...er/graphics.htm
http://www.khalaad.net
http://www.masaher.net/motken
http://www.geocities.com/aboanas11/arsheef.htm
http://www.almosmem.com/otb9
http://www.khayma.com/dakah5/main/index.htm
http://www.godigitalstudios.com/www/color
http://www.geocities.com/SoHo/3505/help/colorcube.html
http://www-students.biola.edu/~brian/csapplet.html

## ماڵپەرەکانی تایبەت بە بەرنامەکانی کۆمپیوتەر بە خۆڕایی

http://www.absba.com/
http://www.noorah.com/
http://www.arabsgate.com/software/
http://deeb.jeeran.com/Index.htm
http://www.amasi.org/download/pafil...901b109e822643b
http://www.wamadhat.com/

## ماڵپەری تایبەت بە وەرزش

**http://www.livescore.co.uk**
**http://www.sport4ever.net**
**http://www.sport.ws/sport**
**http://www.roma4ever.8m.com**
**http://www.yhya.8m.com**
**http://www.fifa.com/**
**http://www.delpiero.org**
**http://www.mnbr.net**
**http://juve4arab.tripod.com**
**http://uefa.com**
**http://sports.naseej.com**
**http://sports.fares.net/ar**
**http://www.italian-soccer.com**
**http://www.raisport.rai.it**
**http://www.emi.co.ae/Calcio**

## ماڵپەڕی تاکە کەسی بەسود

http://www.limosite.net
http://www.noorah.com

## ماڵپەڕی هونەری

http://www.alsindibad.com
http://support.c4arab.com

## ماڵپەڕی تایبەت بە کورتە نامەی مۆبایل

http://setup.awalnet.net.sa/awalsms/Login.asp
http://www.majedpage.com
http://www.itsalat.com/asp/send.asp

## ماڵپەڕی تایبەت بە گەڕان

http://www.yahoo.com
http://www.mysearch.com
http://www.google.com /

## ماڵپەرەکانی تایبەت بە بەرنامەکانی فلاش

http://www.flashyat.net/lesson /
http://www.alqafelah.f2s.com/cgi-bin/upload.html
http://forums.c4arab.net/index.php
http://www.workforislam.com /

## مانای ئەو ژمارانەی کە لەکاتی پەیوەندی بە ئەنتەرنێتەوە دەردەکەون لەکاتی بوونی هەڵە

حسن عمر حسن

زنجیرەی پێنجەم

٧٢٨ سیستەم لە توانای دانانیە بگۆڕی IP بدۆزێتەوە .
٧٢٩ بە ناجێگیری پرۆتۆکۆلی IP ناتوانیت Slip بەکاربهێنیت
٧٣١ پرۆتۆکۆلەکەت ناتەواوە
٧٣٢ گرێبەستێکە لە نێوان کۆمپیوتەری تۆو کۆمپیوتەری ناوەند لە بارەی PPP
٧٣٤ کۆتایی بە پرۆتۆکۆڵی کۆنترۆل هات لە بارەی PPP
٧٣٥ ناونیشانی داواکراو ڕەت کرایەوە
٧٣٦ کۆمپیوتەری ناوەند بە پرۆتۆکۆڵەوە کۆتای هاتوە
٧٣٧ هەڵسە بە گەڕانی بەشی پەیوەندیت
٧٣٨ بەشی پەیوەندیت هیچ ناونیشانێك دەست نیشان ناکات
٧٣٩ برۆتۆکۆل زانیارە دانراوەکانی لا هەڵەن هەڵسە بە دوبارە نوسینی پاس ووۆرد
٧٤٠ بنکەی داواکاریت نا چالاکە بە دوای بگەڕێ
٧٤١ کۆمپیوتەرەکەت پشت بەجۆری تەشفیکردنی زانیاریەکان نابەستێت
٧٤٢ کۆمپیوتەری ناوەند پشت بەجۆری زانیاریە تەشفیرکراوانە نابەستێت
٧٤٣ کۆمپیوتەری ناوەند دوای تەشفیرکردنی زانیاریەکان دەکات
٧٥١ ژمارەی وەڵامدەرەوەی پەیوەندیەکەت ناراستە وە ژمارە ڕێگە پێدراوەکان بریتین لە ٠ تا ٩ وە T , P W وە هەروەها , () - , . .
٧٥٢ لەکاتی چارەسەرکردنی بەرنامەیەکی تێکستی توشی هەڵەیەك بویت
٧٥٣ ببورە پەیوەندیەکەت دەپچڕێت لەبەر ئەوەی بنیاتی پەیوەندیت ئاراستەی چەند کۆمپیوتەرێکی فرە پرۆتۆکۆل کراوە
٧٥٤ ببورە سیستەم ئاماژەیەکی فرە پەیوەست بون دەدۆزێتەوە
٧٥٥ سیستەم ناتوانێت ئەم داواکاریە جێ بەجێ بکات چونکە ئەم پەیوەندیە تایبەتە

## کۆمپیوتەری .دی.تی.کی. کۆمپیوتەری ڕۆژهەلاتی ناوەراستە

کۆمپانیای (Middle East DTK Computer) ی پسپۆڕ لە بواری بەرهەم هێنانی کۆمپیوتەر و ئامیرەکانی تری خزمەتگوزاری پەیوەست بە بواری پەیوەندی کردنەوە، رایگەیاند کە کۆمپیوتەریکی تازەی لە بازارەکانی ولاتانی رۆژهەلاتی ناوەراست بـلاوکردۆتەوە بە ناوی (Presto X55) کە سایزی مۆنیتەرەکەی ١٥,٤ بۆسە دەبیت و وە بە ریژەی ١٢٨٠ × ٨٠٠ بیکسل کار دەکات و یەکەی چارەسەرەکانی لە جۆری (AMD Turion 64) دەبیت و گرنگترین سیفەتەکانی بونی خزمەتگوزاری (Bluetooth) بۆ گواستنەوەی فایلەکان بۆ کۆمپیوتەریکی تر و تەنانەت مۆبایلیش.
کێشی ئەو کۆمپیوتەرە تازەیە لە ٣ کیلۆگرام زیاتر نیە و کۆمەلێك سیفاتی مۆبایلی ئەمرۆی لە خۆ گرتووە لەوانە دەتوانیت تەنها روناکیەکەی کاربکات بەبێ ئەوەی دەنگی هەبێت یان لە شیوەی بێ دەنگ بێت (Silent) بۆ ئەوەی ووزەی کەمتر بەکار بهێنێت و وە لەکاتی وانە و کۆر و سیمینارەکان دەنگی لێوە نەیێت.
(Presto X55) جیادەکریتەوە لە کۆمپیوتەرەکانی تر بە بوونی میمۆرییەکی کاتی لە جۆری (DDR) بە ریژەی ٢ گیگابایت و خێرایەکەی ٣٣٣/٤٠٠ میگاهێرتزە، وە پەپکەکانی (DVD/CD-RW) و (DVD-Dual Drive) لەخۆ دەگریت.

وەرگێرانی لەعەرەبیەوە: کاروان سەعید
سەرچاوە: البوابة العربیة



# پەیوەندی کردنی تەلەفۆنی لە ڕێگای ئینتەرنیتەوە

ئا: هاوکار

وێنەی (٠١)







وێنەی (١)

خۆشەویستان بەهۆی بەنامەی ( voip cheap ) پەیوەندی بکە لە تەلەفۆنی ماڵەوە ئەویش بەرێگای ئەنتەر نێت دەبێت دەتوانیت پەیوەندی بکەیت بۆ ئەم وولاتانەی کەلە وێنەکەدا هاتووە ، ئەم بەرنامەی زۆر بەئاسانی بەکار دەهێندرێت بەم شێوەیە سەرەتا دەچین بەشداری لە ناوبەرنامەکە دەبیت کەئەم بۆشاییانەی کەلە ناو خانەکانداية ئەویش بەدانانی ناو و ووشەی نهێنی وە ووشەی کردنەوە وە نوسینی ئیمێلەکەت

پاشان دەبێتە ئەندام لەناو بەرنامەکەدا وە بەکاری دەهێنی بەو ناوە کەبەشداریت کردووە .
وێنەی (٢)




وێنەی (٢)

پاش کردنەوەی بەرنامەکە ژمارەکانی تەلەفۆنەکە دەبێتەوە بۆ تەلەفۆن کردن بۆیە .وێنەی (٣)




وێنەی (٣)

دوای لێدانی ژمارەی داواکراو کلیك لەسەر ئەو وێنەی دەسکی تەلەفۆنەکە بکەو زەنگ لێدەدات .
وێنەی (٤)




وێنەی (٤)

# تۆمارکردن لەچەند سایتێك بەخۆڕایی

ئامادەکردنی / گۆران شەقلاوەیی - شەقلاوە
gorankumar@yahoo.com

ناوی سایت :- www.hom4arab.com

بۆشایی پێشکەشکراو :- ١٥ مێگابایت

گواستنەوەی مەلەفات :- لەڕێ ی پەڕهەڵدەرەوە

جۆری ڕێکلام :- بانەر

سیفاتەکانی :- مواسەفاتێکی بەرز - هەموو پێگەکە بەزمانی عەرەبی - زیادکردنی چاکسازی بە شێوەیەکی ئاسان - پاڵپشتی کردنی زمانی کوردی .

ناوی سایت :- www.spaceports.com

بۆشایی پێشکەشکراو :- دیاری نەکراو

گواستنەوەی مەلەفات :- FTP

جۆری ڕێکلام :- بانەر

سیفاتەکانی : - پاڵپشتی کردنی SSI - My SQL - CGI - PHP .

ناوی سایت :- www.dk3.com

بۆشایی پێشکەشکراو : -دیاری نەکراو

گواستنەوەی مەلەفات : - FTP

جۆری ڕێکلام : - بانەر

سیفاتەکانی : - پاڵپشتی کردنی SSI - My SQL - CGI - PHP .

ناوی سایت : - www.xoasis.com

بۆشایی پێشکەشکراو : - ٢٠ مێگابایت

گواستنەوەی مەلەفات : - FTP

جۆری ڕێکلام : - بانەر

سیفاتەکانی : - پاڵپشتی کردنی CGI - PHP .

ناوی سایت : - www.f2s.com

بۆشایی پێشکەشکراو : - ٢٠ مێگابایت

گواستنەوەی مەلەفات : - FTP

جۆری ڕێکلام :- بانەر

سیفاتەکانی : - پاڵپشتی کردنی SSI - MY SQL - CGI - PHP .

ناوی سایت : - www.virtualavenue.net

بۆشایی پێشکەشکراو :- ٢٠ مێگابایت

گواستنەوەی مەلەفات : -FTP

جۆری ڕێکلام :- پەنجەرەیەکی دەرەکی

سیفاتەکانی :- پاڵپشت کردنی CGI - Front page - شێوەی ناوەکە وەکو http://your.virtualave.net .

ناوی سایت : - www.crosswinds.com

بۆشایی پێشکەشکراو : - دیاری نەکراو

گواستنەوەی مەلەفات : - پەڕهەڵدەرەوە - FTP

جۆری ڕێکلام : - پەنجەرەیەکی دەرەکی

سیفاتەکانی : - ئەم سایتە بۆشاییت دەداتێ بەبێ دیاری کردن، وە بەبێ ڕێکلام وە ڕێگا دەدات بە دانانی ئیمەیڵی POP٣ ، بەم شێوەیە username@crosswinds.net ، وە دادەنرێت بە ئاسانترین و خێراترین سایت بۆ بەشداری کردن، ناوی سایتەکە درێژ دەبێت بەڵام دەتوانین دوایی کورتی بکەینەوە .

ناوی سایت : - www.netfirms.com

بۆشایی پێشکەشکراو :- ٢٥ مێگابایت

گواستنەوەی مەلەفات :- FTP



جۆری ڕێکلام : - بانەر

سیفاتەکانی : - خێرا - پاڵپشت کردنی front page - CGI - وە ناوەکە بەم شێوەیە دەبێت . your.netfirms.com

ناوی سایت :- www.hypermart.com

بۆشایی پێشکەشکراو :- ٢٠ مێگابایت

گواستنەوەی مەلەفات :- FTP

جۆری ڕێکلام :- پەنجەرەیەکی دەرەکی

سیفاتەکانی : - CGI - front page - شێوەی ناوەکە http://your.hypermart.com .

ناوی سایت :- www.geocities.com

بۆشایی پێشکەشکراو :- ١٢ مێگابایت

گواستنەوەی مەلەفات : - پەرهەڵدەرەوە - FTP

جۆری ڕێکلام : - پەنجەرەیەکی دەرەکی

سیفاتەکانی : - شێوەی ناوەکە http://www.your.geocities.com .

ناوی سایت : - www.freeserver.com

بۆشاپی پێشکەشکراو :- ٢٠ مێگابایت

گواستنەوەی مەلەفات : - پەرهەڵدەرەوە - FTP

جۆری ڕێکلام : - بانەر

سیفاتەکانی : - ناوەکەی کورتە http://www.your.8m.com .

**تێبینی :**

**هەر بەڕێزێك ئەیەوێت بابەت بڵاوکاتەوە لە گۆڤاری کۆمپیوتەر دەرگای بۆ کراوەیە بە مەرجێك یاساکانی ڕۆژنامەوانی پەیڕەو بکات و ڕێسای نووسین بەدی بکات لە کاتی نووسینی هەر بابەتێك.**



# نەخۆشی زۆری بەکارهێنانی کۆمپیوتەر

ئا: کاوە سلیمان



وێنەی ١

ئازیزان لەسەردەمی ئێستادا کەسەردەمی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێتە ئەویش بۆ زیاتر ئاسانکاری بۆ بەکارهێنەرەکەی ئەکا وئامێرکی هەستیارە وەبەهۆی ئەنتەرنێتەوە دەتوانرێت پەیوەندی بە وولاتانی دەرەوە بکەیت وەچات بکەیت ئینجا پەیوەندیەکە یان زیانیاری بێت یان بازرگانی بێت یا خۆشەویستی بێت ، وە ئەوکەسانەی کەبەردوام لەسەر کۆمپیوتەرن وتا زیاتر لە (١٠) کاتژمێر بۆیە تۆشی بێ هیزو لاوازی لەش دەبن وەبەتاییەتی چاوەکانی وەهەر وەها ماندوبونێکی تەواوی مێشك ، وەتەنانەت لەکاتی نوستنیشدا بەردەوام تووشی ژانە سەرن وحەسانەویان نیە



بۆ دکتۆرەکانمان رێنمایمان دەکەن زۆری بەکاهێنانی کۆمپیوتەر بۆیە دەبێ کاتی بۆ تەرخان بکرێت ، چونکە زۆر لەوکەسانەی کەبەردوام لەسەر ئامێرەکانیانن هەست بەبێزاری دەکەن لەناخافتندا بۆیە ئێمە دەبێ رۆژانە کەمتر لە(١٠) کاژمێر کۆمپیتەر بەکاربهێنین .

وێنەی ٢

# بەرنامەی تایبەت بەمۆبایل

# Sony Ericsson Themes Creator

ئا: فاخر محمود

بەرێزان وەك ئاگاداران دنیای مۆبایل هەرلەپێشکەوتنە و رۆژبەدوای رۆژیش شتی پێشکەوتوتر دەردەچێت لەم بوارە کەچەندەهاجۆری پێشکەوتو کەوتۆتەبەردەستان کەبەرنامەی وای تێدایە لەکاتی سەیرکردنی بۆلای‌خۆی راتدەکێشێت وەك جوانی باکراوند و جوانی گۆرانی بۆبەشەکانی تر ئێمەش زۆرجار حەزدەکەین مۆبایلەکانمان وێنەی خۆمانی تێدابێت یاخود وێنەیەك کەبەئارەزوی‌خۆمان بۆی دابنێین بەلأم ئەگەر بێت و بەرنامەیەك هەبێت کەتێکڕای بەرنامەکانی ناو مۆبایلمان بۆبگۆڕێت لەسەرداواکاری خۆمان ئەوکاتە زیاتر خولیای مۆبایلەکانمان دەبین لەبەرئەوەی ئێستا هەمووکەسێك بیەوێت دەبێتەخاوەن کۆمپیوتەری‌خۆی ئەوکاتە تەنها پێویستیت بەبەرنامەکە دەبێت بۆکارکردن بەویستی خۆت لەبەرئەوەی کەس وەك خۆت کارت بۆناکات بەرێزان کارکردن لەسەرئەوبەرنامەیە زۆر گران نیە تەنها لەگەڵم بن بەوردی هەموکارەکان شی‌دەکەمەوە لەبەرئەوەی هەمو هەنگاوەکان تەنها داوای وێنەیەکت لێدەکات تۆش وێنەکەی دەدەیتێ ئەویش بۆت رێکدەخات تەنها هەنگاوی پێش کۆتایی نەبێت کەداوای دەنگێکت لێدەکات و تۆش دەیدەیتێ بەرێزان ئەوبەرنامەیەتەنها بۆ مۆبایلی جۆری Sony Ericsson ە سەرەتا دێیت بەرنامەکە دەکەیتەوە (وێنە ١)




وێنە ژمارە ١

پاشان کلیکێك لەسەر فایل دەکەیت و یەکەم نوسین هەڵدە بژێریت کە Change Phone لێدەدەی ئەم لیستە دێتە بەرچاو وێنە ١ کەلیستی مۆبایلەکانە بەگشتی ئینجا تۆ کام مۆدێلت هەیە هەرئەوجۆرە هەڵدەبژێریت پاشان وێنەی ئەومۆبایلەی هەڵت بژاردوە دێتە روی بەرنامەکە لەلای‌سەرەوە یەکەم نوسین standbay یە، هەروەهالەناوەراست imoprt all & import هەیە تۆئەگەر بتەوێ وێنەیەك بۆ روی یەکەمی مۆبایلەکە دیاری بکەیت لەرێگای import تەوە دێنیتە ناوبەرنامەکە یەکجار کلیك لەسەر import دەکەیت لیستی هاردەکان دەبێتەوە ئینجا تۆ وێنەکەت لەکام هار داناوە دێیتە سەر وێنەکە دووجار کلیکی لەسەردەکەیت راستەو خۆ دێتەناوبەرنامەکە بەلام لەگەر هاتنی وێنەکە لیستێکت پێنیشان دەدات کەپێت دەڵت ئەووێنەیە گەورەیە یاخود بچوکە دەبێت قەبارەی پربەمۆبایلەکەبێت تۆئەوکاتە بەئارەزوی خۆت دەتوانی وێنەکەبچوك بکەیتەوە تائەوکاتەی کەپربەشاشەی مۆبایلەکەت دەبێت وەلەهەمان کاتیشدا دەتوانی بچوکی نەکەیتەوە یەکسەر دایبنێیت (وێنە ٢)



وێنە ژمارە

پاشان دێینە سەرلیستی دووەم کەئەویش بریتیەلە Desktop واتا روبەری مۆبایلەکەت لەوێوەش هەمان کردار دوبارەدەکەینەوە پاشان دێیت یەکبەیەك ئەمکارەدەکەیت پاشان دێیتە سەر فایل لەوێوەش save as کارەکەت تەواو دەبێت ئینجا لەرێگای ( Infrared ) ئینفرارێت یاخود بلوتوس دەینێریت بۆسەر مۆبایلەکەی خۆت.

# ئەو ( avi ) یانەی کەنابنەوە

ئا: سامان نجیب




وێنەی ژمارە ١

بەرنامەی ( cam tasia ) بۆ ئەو avi ەی کە ناکرێتەوە بەکاردێت ئینجا یان بە هۆی تێکچونی یان لە ئەنتەرنێتەوە هاتبێ یانیش avi ەکە بچوك بێت بۆیە بەهۆی ئەم بەرنامەیە دەتوانن avi ەکان بکەنەوە وەزۆر بەئاسانی لەسەرتا دەچینە سەر فایل و دەیکەینەوە وێنەی ( ٣ )




وێنەی ژمارە ٣

وە دەستنیشانکردنی ئەو avi کەمەبەستمانە لە پاشان دەیکەینەوە وە (وێنەی ٤)




وێنەی ژمارە ٤

تێبینی : ئەم بەرنامەیە دەتونرێت avi ی تێك چوو چاك بكاتەوە بەتایبەتی ئەو مۆنتاژانەی كە بەaviی دەكرێت كەزۆر جار تێك دەچێت وەناكرێنەوە .

# Nature illusion studio

بەختیار سەباح رواندزی
Baxtear_80@yahoo.com

بەرنامەیەکی ئێکجارجوان‌و ئاسانە، بۆ دروستکردنی ( screen sevar) لەو وێنانەی کە زیاتر دیمەنێکی سروشتیان هەیە، واتا تۆ دەتوانی ببیە خاوەن سکرین سیڤەرێکی زۆرجوان بە ئاسانترین ڕێگە. وەکو جوڵان‌و هاتنە خوارەوەی خورەی ئاو، لەگەڵ بیستنی دەنگی ئاوەکە، یاخود بارینی بەفرو باران بەم شێوەیەی خۆت ئارەزوو دەکەی، کە وەکو ئەوەی شێوەی ڕاستی هەبێت. ئەم بەرنامەیە بەکاربێنە، لەمەودوا پێویستت بە کڕینی سکرین سێڤەر نابێت . دوای ئەوەی کە بەرنامەکەت دابەزاند بۆ سەر کۆمپیوتەر، هەڵدەستیت بە کردنەوەی بەرنامەکە لە پرۆگرام، پاش ئەوەی کە ڕووکاری بەرنامەکە بە دەرکەوت کلیك لەسەر ( New) دەکەین، دواتر بۆ هینانی وێنەیەکی تازە کلیك لەسەر(**load Image**) دەکەین، لەو شوێنەی لە ناو کۆمپیوتەر هەڵمان گرتووە . سەرنج بدە وێنە ( ١ ) .




وێنە ژمارە ١

دوای ئەوەی کە وێنەکەمان دەست نیشان کرد، کلیك لەسەر ( OK ) دەکەین، وێنەکە دەچێتە سەر ڕووپەری بەرنامەکە. سەرنج بدە وێنە ( ٢ ) .



وێنە ژمارە ٢

دواتر بەو بەزنەیەی کە لە بەرنامەکەدا هەیە، ئەو شوێنە ڕەنگ دەکەین کە دەمانەوێت، جولانی لەسەر دروست بکەین، لە پاش ئەمە کلیك لەسەر ( Preview ) ی سەرەوەی تولبارەکە دەکەین بۆ بینینی کاریگەری لەسەر وێنەکە. دوای ئەمە لە فرمانەکانی لای چەپی بەرنامەکە، دەتوانین شێوەی جولانی ئاوەکە بگۆڕین‌و وەیان بمانەوێت دەنگی ئاوەکە دادەنێین‌و یاخود باران یان بەفر ببارێت، چەندین کاریگەری تر دەتوانی بەکاریان بێنی، واتا تۆ دەتوانی یەکێك لە وەرزەکانی ساڵ بۆخۆت دروست بکەی . وەك لە وێنەی ( ٣ ) دیارە بەفر دەبارێت.



وێنە ژمارە ٣

لە کۆتاییدا دەتوانین کلیك لەسەر ( SAVE ) بکەین‌و بە شێوەی سکرین سێڤەر خەزنی بکەین. بۆ وەرگرتنی بەرنامەکەش سەردانی ئەم سایتە بکە.

www.nufsoft.com

# چونیەتی پێك گەیاندنی دوو کۆمپیۆتەر بۆ بەشداری لەیەك هێلی ئەنتەرنێت

ئامادەکردنی : ئیسماعیل خەلیل ئاکرەیی
ismail_aqrawe@yahoo.com

بێ گومان هەر کەسێك کەوا ئامیری کۆمپیۆتەر بە کاردێنی حەز ئەکات کەوا ئەنتەرنێت لەسەر کۆمپیۆتەرەکەی هەبێ و بەکاری بێنی، بەڵام ئەوەش ناکرێت هەتا ئەو کۆمپیۆتەرە بەشداربێت لە هێلی ئەنتەرنێت یان هێلی ئەنتەرنێتی تێدا بێت بە شێوەی کارت یان هەر شێوەیکی تر، لێرەدا من بە پێویستم زانی کەوا باس لە رێگایێك بکەم کەوا دوو کۆمپیۆتەر بەشداری بکەن لە یەك هێلی ئەنتەرنێتەوە و هەروەها هەردوو کۆمبیۆتەر سودی لێ وەربگرن، رێگایەکەش ئەمەی خوارەوەیە :

یەکەم: ئەبێ هەردوو کومپێوتەر کارتی تۆری ( Network ) یان هەبێت .

دووەم: ئەبێ کێبلی بە یەك گەیشتنی هەردوو کارت هەبێ .

سێ یەم: پێویستە کێبلەکە لە جوری ( CROSS CABLE ) بێت، نابێت کێبلێکی عادی بێت چونکە کۆمپیۆتەری بەرامبەرت نادوزیەوە تەنها بەو کێبلەی کە لەسەرەوە ئاماژەم پێ کردوە ئەی دۆزیەوە .

ئەنجا ئەچینە سەر پێناسە کردنی تۆرەکە، لە یەکێك لە کومپیۆتەرەکان ئەم هەنگاوانەی خوارەوە یەك لە دوای یەك بکە :

یەکەم جار بچۆ بۆ سەر فەرمانی start و کلیکی لەسەر بکە پاشان بچۆ بۆ سەر settings وپاشان بچو بۆ سەرcontrol panel پاشان بچو سەر network پاشان addپاشان بچو سەر protocolپاشان لە کۆمپانیەکان Microsoft هەلبژێرە، پاشان لە بەرامبەرەکەی TCP/IPهەڵبژێرە ئەمەش پێویستە ئەگەر ویستت بەشداربی لە ئەنترنیت، بەڵام ئەگەر ویستت تەنها بەشداربی لە فولدەر و هەر شتیکی تر ئەوسا هەلبژاردەی تری ئامادکراوی هەیە بۆ ئەمە مەبەستە . پاشان OKکلیك بکە هەتا پرۆتوکولەکە بەتەوای ئامادەبێ . پاشان بچو بۆ سەر TCP/IP، بەڵام وریابە نەچی بۆ سەرAdaptor-TCP/IP dialupبەلام بچۆ بو سەر TCP/IPئەوەی تایبەت بە کارتی تۆڕەکەوە، بۆ زانین ناوی کارتەکە لە پاش TCP/IPدێت ئەمەیە کە گۆڕانکاری لێ دەکرێت. پاشان دوو جار کلیك بکە، دوایێ بچو بۆ سەر IP ADDRESSو دووەم هەڵبژاردە هەڵبژێرە و ئەم ژمارانە لە ناو هەردوو خانەی سەرەوە و ژێرەوە بنوسە بەڵام ورەیابە هەلەنەکەیت لە کاتی نوسینیاندا :

" ١٩٢,١٦٨,٠,١ " " ٢٥٥,٢٥٥,٢٥٥,٠ "

پاشان OK کلیك بکە، پاشان کلیك بکە لەسەر خاڵی پەیوەندی نێوان فولدەر و چاپکردن، و هەر لەناو چوارگوشەکە ئەبینی ئەوەی کە نیشی تێدا ئەکەیت پاش داخستنی TCP/IP ، و نیشانەی راست لە هەردوو خانە دابنێ . پاشان بچۆ بۆ سەر Identification لەسەرەوە ، کە دەبێتە هەلبژاردەی دووەم ، پاشان سێ خانە ئەبینی، لەخانەی یەکەم ناوی تایبەت بە کۆمپیۆتەرتەرەکەت بنوسە ، و لە خانەی دووەم ناوی تۆرەکە بنوسە بۆ نمونە ( HOME )، و خانەی سێیەم بە بەتالی بەجێ بهێلە، پاشان OK کلیك بکە،لێرەدا کۆمپیۆتەرکە لە خۆیەوە رێستارت ئەبێ هەتا کۆمپیۆتەری یەکەم ئامادەکاربێ . پاشان ئەو هەنگاوانەی پێشو کە لەسەر کۆمپیۆتەری یەکەمان کرد لەسەر کۆمپیۆتەری دووەم جێبەجێ بکە ، بەلام تەنها لە جیاتی ژمارەی یەکەم ئەوەی خوارەوە بنوسە:

" ١٩٢,١٦٨,٠,٢ "

و ناوی کۆمپیوتەرەکە بگۆرە بەناویکی تر، بەلام هەر بەناوی تۆرەکە (HOME ) ، و هەر وەك هەنگاوەکانی پێشو جێبەجێ بکە. پاشان کۆمپیۆتەرەکە ریستارت بکە ، و ئەبێ تۆرەکە ئامادەکار بێ ، و بۆ زیاتر دلنیابوون کەوا تۆرەکە لە کاردایە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بکە :

یەکەم جار بچو بۆ سەر My Computer و کلیکی لای ڕاست لە سەر فۆلدەری C بکە و (Sharing) هەلبژێرە، و هەمان هەنگاو لە سەر کۆمپیوتەری دووەم بکە، پاشان لە یەکێك لە کومپیوتەرەکان بچوە سەر Network) (Neighborhood ، ئەگەر کۆمپیوتەری بەرامبەرت بینی ئەوا مانای وایە کە تۆڕەکە تەواو ئامادەکراوە، وە بۆ دلینابوون بچو ناویەوە ئەبێ فۆلدەر C ببینی ئەوەی تایبەتە بە کۆمپیوتەرەکەی بەرامبەر.

ئیستا تۆڕەکە ئامادەیە، بەلاّم پەیوەندی لە نێوانیاندا پێویستی بە بەرنامەیەکی هەیە، زور بەرنامە هەن، بەلام بەرنامەیەکی زۆر باش و سادە هەیە، هێچ شتیکی ناوێت تەنها ئیشپێکردنی ، بەرنامەکەش ناوی AnaloX Proxy و قەوارەکەی ١٨٨,١ K ولەم سایتەی خوارەوە بە خۆرایی دایبەزێنە :

http://www.analogx.com/files/proxyi.exe

لەسەر هەردوو کۆمپیوتەر دایبەزینە ، و ئەگەر ویستت ئیشی پێ بکەیت بچۆ بۆ سەر C:\Program Files\AnalogX\Proxy لە ناوفولدەرەکە ئەبینی و ڕەنگی سەوزە ، و بۆ ئیش پێ کردنی یەکەم جار پەیوەندی ئەکەیت بە ئەنترنیتەوە لە ڕێگای یەك لە کومپیوتەرەکان و کۆمپیوتەری دووەم لە یەکەم وەرئەگری ، ئەنجا بەرنامەکە لەسەر کۆمپیوتەری یەکەم ئیش پێ ئەکەیت، ئەو کۆمپیوتەری کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ئەنترنیتەوەی هەیە، شتیکی گرنگ ماوە ئەویش ئەوەیە لە کۆمپیوتەری دووەم ئەوەی لە یەکەمەوە ئەنتەرنێت وەرئەگری ، بچۆ بۆ سەر ( Internet Explorer ) و یەکسەر (STOP ) دابگرە و پاشان بچو بۆ سەر Tools پاشان ( Internet Option )، وە ( Coonection) هەلبژێرە، پاشان لە کۆتایی بچو بۆ ( LAN) و نیشانەی ڕاست لەسەر بەکارهێنانی بروکسی دابنی، و ئەم بروکسیەی بنوسە: "١٩٢,١٦٨,٠,١" ، بەلاّم ئاگاداربە من وام داناوە کەوا ئەو کۆمپیوتەری ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ئەنترنیتەوە هەیە ئەوەیە کەوا( IP ADDRESS) ژمارە: "١٩٢,١٦٨,٠,١ " ، گرنگ ئەوەیە لێرە کەوا دانانی ( IP ADDRESS)ی کۆمپیوتەری ڕاستەوخۆ کە پەیوەندی بە ئەنتەرنێتەوە هەیە، ئیستا هەموو شتێك تەواو ئامادە بووە، ئێستا ئەتوانی پەیوەندی بەئەنتەرنێتەوە بکەیت لە ڕێگای کۆمپیوتەری یەکەمەوە، پاشان بە شێوەیەکی ئاسایی کۆمپیوتەری دووەم ئیش پێ بکەیت، و توانای پەیوەندی لە نیوان هەردوو کۆمپیوتەر تاقی بکەیت، بەلام لەبیرت نەچێ کەوا لە کۆمپیوتەری دووەم بچی بۆ سەر Tools پاشان بۆ سەر Internet Optionو لە بەشی Coonection هەلبژاردەی یەکەم کەوا ئەڵێ داخوازی پەیوەندی نەکرێت هەلبژێرە، ئەم هەنگاوە بۆ ئەوەیە کەوا ڕاستەوخۆ لە تۆڕەوە ئەنتەرنێت وەرگرێ.

**تێبینی : هەر بابەتێك بلاّو بکرێتەوە پاداشتی پێ دەدرێت .**

- **هەر بابەتێك لە شوێنێك یان لە گۆڤارێکی تری کوردی بلاّو کرابێتەوە ئێمە بلاّوی ناکەینەوە .**
- **ئەگەر بابەتەکان نەشیا بۆ بلاّو کردنەوە ئەوا بابەتەکە ناگەڕێندرێتەوە بۆ خاوەنەکەی .**
- **هەر کەسێك بابەت ئەنێری بۆ بلاّو کردنەوە لە گۆڤارەکەمان با بە تەواوی باسی بابەتەکە ڕوون بکاتەوە ویە بەرنامەی Microsoft Word بابەتەکە بنووسرێت و وێنەکانی ڕوونکەرەوە لەگەڵ هەمان بابەت بنێرێت بۆمان بەلاّم با وێنەکان لە نێو فۆلدەرێکی جیاواز بێت و لەسەر سیدی یان لەسەر فلاش میمۆری بۆمان بنێرێت.**

# مامەڵەکردن لەگەڵ نامە هەڵەیی یەکان

نووسینی / کامەران خۆشناو - شەقڵاوە
Kameran760@hotmail.com

لە خۆشی و بەختی بەکارهێنەری کۆمپیوتەرە کەوا سیستەمی ویندۆز لەکاتی ڕوودانی هەر گرفتێك و کێشەیەك لە پارچەکان بێت یاخود بەرنامەکان نامەی هەڵە پیشانی بەکارهێنەران دەدات، وە ئەم نامانە گرفتەکە دیاری دەکەن ، وە هەروەها هاوکاریت دەکەن بۆ چارەسەرکردنی، وە نامە کێشەیی یەکان دەکرێ لەیەکێك لەم شێوانە بێت .

- نامە هەڵەیی یەکانی دەنگی Post beep codes
- نامە هەڵەیی یەکانی بینراو – Display Screen Message
- نامە هەڵەیی یەکانی ژمارەیی Hexadecimal numeric codes

**نامە هەڵەیی یەکانی دەنگی Post beep codes**

ئەم نامانەبە چەند ژمارەیەکی دەنگ (نەغمە) beep دەردەبڕێن، کە پارچە یاخود بەشی تێکچووەکە دیاری دەکات، وە لەحاڵەتی نەبوونی هیچ کێشەیەکدا ئەوا گوێ بیستی ئیشارەتێکی دەنگی کورت دەبین، وە شیفرەی هەڵە و تێکڕووەکان بریتین لە چەند پارچەیەکی نەغمەی کورت و درێژ، وە جیاوازی ئەم پارچە لە ئامێرێك بۆ ئامێرێکی تر ئەوەستێ لەسەر جیاوازی جۆری سیستەمی Bios لەسەر ئامێرەکە .

**نامە هەڵەیی یەکانی بینراو Display – Screen Message**

بریتین لەو نامانەی کەوا ژمارە پیشان دەدەن لە قەبارەی ئەو زاکیرەیەی کەوا تاقی کراوەتەوە، بۆ نمونە ٦٤ KB ok واتە تاقی کراوەتەوە ٦٤٠MB لە زاکیرەی تەقلیدی و زیادکراو، وە ئەگەر لەدەرئەنجامی تێست کردنەکە هیچ گرفتێك نەبوو ئەوا ئیعلانی سەرکەوتنی تاقی کردنەوەکە دەکرێت، بۆ نمونە ئەم نامەیە ٣٢٧٦٨ KB ok واتە ئەو ئامێرەی کە قەبارەی زاکیرەکەی ٣٢MB بوو ئەوا تاقی کراوەتەوە بەسەرکەوتوویی لەکاتی Post کردندا، ئەمەش تەنها دەکرێت لەکاتی بەکارهێنانی کارپێکەری زاکیرەی درێژکراوە، بۆ نمونە Emm٣٨٦.exe، کە هەڵدەسێ بەدانانی زاکیرەی زیادکراو وەکو ئەوەی کەزاکیرەی درێژکراوە بێت، وە دەبێتە هۆی ئەوەی کەوا تاقی بکاتەوەو بیخاتە سەر زاکیرەی ماوە، بەڵام لەحاڵەتی تەواو نەکردنی تاقی کاریەکە نامەیەك دەبینین کەوا قەبارەی زاکیرەکە کەمترە لەوەی چاوەڕوان دەکرا، ئەمەش دەلیلە کەوا تێکچوونێك وە کێشەیەك هەیە، کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی ئەم نامە هەڵەیە لەسەر شاشەکە، لە شێوەی شیفرەی ژمارەیی کە پێکدێت لەچەند ژمارەیەك ، نمونە ١٧٩٠ – Disk .error .

ئێستاش بە ناوبانگترین جۆرە نامە هەڵەیی یەکان کە دەردەکەون لەسەر شاشە ڕوون دەکەینەوە، وە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم هەڵانە، کە دەبنە هۆی دروست بوونی ئەم نامانە .

**هەڵەیی یەکانی پاراستنی گشتی**

بنچینەی هەموو نامە هەڵەیی یەکان بریتی یە لەنامەکانی GPF کە کورتکراوەی General Protection Fault، ئەمانەش دەردەکەون لەکاتی بەکارهێنانی یەکێك لەبەرنامە کارپێکراوەکان لەزاکیرەی RAM، بەوەی کەوا سیستەمی Windows تایبەتی کردبوو بۆ کارپێکەری تر، یاخود تایبەتی کردبوو بۆ ئامێری تر، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دەتوانرێ چارەسەری ئەم نامانە بکرێت لە ڕێگای داخستنی بەرنامەکە یاخود کارپێکەرەکە، کە بۆتە هۆکاری پەیدابوونی ئەم نامەیە وە دووبارە هەڵگیرسانەوەی ئامێرەکە، وە ئەگەر ئەم گرفتە بەردەوام بوو ئەوا تەئکید بکەرەوە لەسەر ئەمانەی خوارەوە : -

١. سەرچاوە سیستەمیەکان گونجاون ؟ کاتێك سەرچاوە سیستەمیەکان system resources وەکو پێویست تەواو نین، ئەوە دەبێتە هۆی تەشجیع کردنی هەندێ لەبەرنامەکان کەوا بۆشایی بەرنامەکانی تر بەکاربهێنن، کە ئەمەش دەبێتە هۆی تێکەڵاو بوون و تێکچوونی کارەکە، ئەگەر ئەمە ڕوویدا ئەوا هەوڵ بدە بەرنامەی کەمتر کار پێ بکەیت، یاخود هەڵسە بە زیادکردنی زاکیرەیەکی نوێ، یان لابردنی هەندێ بۆشایی لەسەر هارد دیسك،
٢. کارپێکەری Driver تایبەت بەهەر ئامێرێك . تەئکید بکەرەوە لەوەی کەتۆ نوێترین کارپێکەر بەکاردەهێنیت بۆ کاڵا ڕەقەکان Hardware، کەهەن لەنێو ئامێرەکەت .
٣. ئامادە نەبوونی داتاکان .

وەئەم هەڵەیە ڕوودەدات کاتێك بەرنامەکە داوای چەند داتایەکی دیاریکراو دەکات، وەئەم داتایانە ئامادەنین لە RAM ، یاخود لە زاکیرەی وەهمی ئامێرەکە Virtual

Memory ، لەزۆربەی حاڵەتەکاندا ئەم حاڵەتە نابێتە هۆی ڕوودانی هەڵە، چونکە کۆمپیوتەر خۆی هەڵدەسێ بە داواکردنی داتا لە دسکەکان، دوایی دای ئەنێت لە زاکیرە، بەڵام ئەگەر کۆمپیوتەر ئەم داتایانەی نەبینیەوە لەسەر دسکەکان ئەوا هەڵەیەك ڕوودەدات بە ناوی Invalid Page Fault، لەبەرئەوە پێویستە تەئکید لەسەر ئەمانەی خوارەوە بکەینەوە .

١. کەمی قەبارەی RAM . ئەگەر قەبارەی RAM کەم بوو ئەوا کۆمپیوتەرەکە بەکەفائەتێکی چاك کارناکات، ئەگەر ئامێرەکەت پێکهاتووە لە ڕامی ١٢٨ مێگابایت یاخود کەمتر، وا باشترە بیگۆڕیت یاخود زیادی بکەیت بۆ ٥١٢ مێگابایت یاخود زیاتر .

٢. دابەزینی بۆشایی دسکی خەزن کردن . سیستەمی ویندۆز دسکی ڕەق hard disk بەکاردەهێنێت وەکو زاکیرەیەکی گریمانەیی، لەبەرئەوە هەوڵ بدە مەلەفە زیادەکانی سەر دسکی ڕەق لابەریت بۆ زیادکردنی بۆشایی خەزن کردن .

٣. تێکچوونەکانی Virtual Memory . لەوانەیە هەندێ لەبەرنامە دا بەزێنراوەکان ببنە هۆی تێکچوونی هەندێ داتا لە Virtual Memory، وە دەبێتە هۆی نەشیاوی بەکارهێنانی ئەگەر ئەمە ڕوویدا ئەوا ویندۆز دابخەوە دووبارە کری پێبکەرەوە، وە ئەگەر کێشەکە بەردەوام بوو ئەوا هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کەمی بۆشایی خەزن کردن .

٤. هەڵەکانی بەشداری کردنی داتاکان . ئەمە ڕوودەدات لە دەرەنجامی هەوڵی بەکارهێنانی یەکێك لەبەرنامەکان یاخود کارپێکەرەکان، بۆ چەند داتایەکی دیاریکراو، وە لەهەمان کاتدا ئەم داتایانە شوێنی بەکارهێنانن یاخود چاککردنن لەلایەن بەرنامەیەکی ترەوە .

**نامەکانی گیفایەت نەبوونی زاکیرە Insufficient Memory**

بەدیاردەکەوێت لەکاتی کارپێکردنی زیاتر لەبەرنامەیەك، کاتێك ئامێرەکەت پێکهاتووە لە زاکیرەیەك کە شوێنی خەزنکردنی تەواوی نی یە بۆ فایلەکانی ئەم بەرنامانە یاخود کردنەوەی، لەهەموو حاڵەتەکاندا پێویستە هەڵسین بەداخستنی ئەم بەرنامانە وە دووبارە کارپێکردنی ویندۆز، وە ئەگەر کێشەکە بەردەوام بوو ئەوا بەدوای دوو چارەسەردا بگەڕێ .

١. ئەگەر ئامێرەکەت پێکهاتووە لە ڕامی ١٢٨ ئەوا بەسە بۆ کارپێکردنی هەندێ بەرنامە لەیەك کاتدا، وە لەم حاڵەتەدا هەوڵ بدە مەلەفە زیادەکان یاخود بەکارنەهاتووەکان لابەریت لەسەر هاردیسك، بۆ زیادکردنی بۆشایی بەتاڵ لەسەر هاردیسك .

٢.ئەگەر ئەو کارپێکەرانەی کە بەکاریان دەهێنیت پێویستیان بەزاکیرەیەکی زۆری RAM هەبوو ئەوا هەوڵ بدە بە زیادکردنی زاکیرەی RAM بۆ ٥١٢ یان زیاتر .

**نامەی Fatal Exception Error**

بە گشتی ئەم نامەیە بەدیاردەکەوێت لەسەر شاشەیەکی شین لە دەرەنجامی کێشەیەکی ئاڵۆز، ئەگەر کێشەکە ڕوویدا لەکاتی چوونە ژوورەوەی ویندۆز ئەوا دووبارە کاربەئامێرەکە بکەرەوە لەنێو سیستەمی Safe Mode، ئەویش بەکلیك کردنی دوگمەی F٨ ، پاش یەکەمین زەنگ کە ئامێرەکە دەریدەکات، وە پاشان safe mode دیاری بکە، ئەگەر کێشەکە ڕوودەدات لەکاتی کارپێکردنی یەکێك لەبەرنامەکان ئەوا ویندۆز هەڵدەسێ بە داخستنی بەرنامەکە، وە هەروەها ئەم نامەیە بەدیاردەکەوێت لەکاتی دابەزاندنی بەرنامەیەکی تازە، کە هۆکاری گرفتەکە ڕوون دەکاتەوە .

**نامەی هەڵەی mmsystem.dll یان rundll٣٢**

هەردوو مەلەفی mmsystem.dll وە rundll٣٢ نامەی هەڵەی جۆری GPF دەردەکەن، ئەگەر مەلەفی system.ini تووشی تێکچوون هات یاخود خاڵی بوو لە دێڕی Drivers = mmsystem.dll وە ئەگەر کێشەکە بەردەوام بوو ئەوا هەڵسە بە کردنەوەی بەرنامەی notepad وە کردنەوەی مەلەفی system.ini لە فۆڵدەری c:windows ، وە لەنێو مەلەفەکە ئەگەر ئەم دێڕەت نەبینیەوە Drivers = mmsystem.dll ئەوا کارسەرەکە لە کۆتایی دێڕەکان دابنێ وە کلیکی enter بکە ، دوایی بنوسە Drivers =mmsystem.dll ، وە مەلەفەکە خەزن بکەرەوە وە restart بە ئامێرەکە بکەرەوە .

**نامە هەڵەیی یەکانی ژمارەیی Hexadecimal numeric codes**

لەکاتی کارپێکردنی ئامێری کۆمپیوتەر سیستەمی Bios هەڵدەسێ بە تاقی کردنەوە، ئەویش بەناردنی شیفرەی تاقیکاریەکە بۆ ناونیشانی تایبەت لە دەرچەکانی ناوەوەو دەرەوەدا، وە دەتوانرێ بخوێنرێتەوە تەنها بەهۆی کارتی گونجانی تایبەت، کە دادەنرێت لەسەر یەکێك لەدەرچەکانی ئامێرەکە، وە ئەم کارتە لەلایەن کۆمپانیاکانەوە چەسپ دەکرێن وە پێویستیان بە شاشە نی یە، بەڵکو پاڵپشت کراون بەچەند لەمپەیەکی ڕوون کەرەوە ، کە تەمسیلی ژمارەیی دەکەن بە سیستەمی hexadecimal، وە لەحاڵەتی بوونی کێشە ئەم لەمپانە